زنجیرەی دۆسێیە فەرهەنگی و فیکریەکان

دۆسێی ژمارە ( 13 )



# کورد و ئەفسانەکانی کوشتاری ئەرمەن

نووسینی: محەمەد هەریری

چاپی ئەلکترۆنی یەکەم: حوزەیرانی 2022

زنجیرەی دۆسێیە فەرهەنگی و فیکریەکان

دۆسێی ژمارە ( ١٣ )

# کورد و ئەفسانەکانی کوشتاری ئەرمەن

نووسینی: محەمەد هەریری

چاپی ئەلکترۆنی یەکەم:  حوزەیرانی ٢٠٢٢

دیزاینی بەرگ و ناواخن: هادی هونەر

# دەروازەیەك

دەیان بابەت سەبارەت بە مەسەلەی كوردو ئەرمەن دەخوێنمەوە بە یەك ئاراستەی باو، بۆیە هەر نووسینێك دەرچێ لە وەزعی باو ومەئلوفدا تووند دەردەكەوێت لەبەرچاواندا. منیش فێرنەبووم شتەكان بجوومەوە بێ وردبوونەوە و چوونە سەر سەرچاوەكان.

بە نسبەت كوشتاری ئەرمەنەوە، لە ڕاستیدا هەموو مرۆڤێك لە ئێمە دەبێت ئیدانەی ئەو كوشتارەی ئەرمەن بكات و نوسەری ئەو دێرانەش بە توندترین شێوە ئیدانەی دەكات، بەڵام ئیدانە كردنی دەبێت بە شێوەیەكی هاوسەنگ و زانستیانە و واقیعیانە بكرێت، نەك بە ڕووحیەتی تاوانبارێكی پەشیمان بووەوە، بە هۆكاری گرێی هەستكردن بە تاوانێك خۆشت تیایدا سەدان تاوانت بەرامبەردا كراوە، لە یەك كاتدا وەك ئەوان تاوانبار و تاوانلێكراو بوویت. ئەرمەنەكان دەیانەوێت بۆ خەڵك كەیسەكەیان وا وێنا بكەن، كە خەڵكێكی هەژار و بێوەی بوون، لەبەرئەوەی مەسێحی بوون، موسڵمانانی دەمارگرژی تورك و كورد فەتوای قڕكردنیان دەركردن، توانیتیان خەڵكێكی زۆر بەو ئەفسانەیە بهێننە باوەڕ، و هەتا ڕۆشنبیرە كوردە ڕۆژنامەوانیەكانیش باوەڕیان كردوە بەو ئەفسانەیە لەبەر تەنكی ئاستی فەرهەنگیان.

نەخێر وانیە ئەرمەنەكان وەك خەڵكی كوردستان و هەڵەبجە و ئەنفالستانی كوردستان نەبوون، بێ گوناه و بێ ئەنجامدانی تاوانی دژە مرۆیی ئەو تاوانە كۆمەڵكۆژیەیان لە دژیدا بكرێت. كورد لەوەتی هەیە كۆمەڵكوژیەكی دژی میللەتێكی تر نەكردوە، هیچ كوشتاریەكی گوندی ئەرمەن و تورک و فارس و عەرەبانی نەكردوە وەك دەستپێكەر وكەڵەگایی.

دەیەها ساڵە ڕۆشنبیری كورد بەو پەڕی نەزانیەوە مێژوی خۆی هەڕاج دەكات وپۆزش بۆ دوژمنانی دەهێنێتەوە، بێ ئەوەی لە وردەكاری مێژوو وئەو سەردەمە گەیشتبێت.
بە داخەوە بەشێكی زۆری ڕۆشنبیری كورد وادەزانن، خۆ نیشاندان وەك كەسانێكی پێشكەوتوخواز و سێكیولار، بە نەفرەت كردنەوە دێت لە هەموو كلتور و مێژووی با وباپیرانمان، دەیانەوێت بە چاویلكەی ئەمرۆی سەدەی بیست ویەك مێژووی سەدان ساڵی كورد بخوێننەوە! هەر بۆیەش دەیانبینیت لاوازترین وبێ ئەرزشترین خەڵكن لەناو كۆڕی ڕۆشنبیرانی گەلانی جیهان.

كەس بەقەد ئەو لە مێژوو دابڕاوانە و دانەمەزراوانە و بێ بناغانە لەرزۆک نین بەرامبەر ڕۆشنبیرانی میللەتانی تر. چونكە حەزی بە دین نییە، دەیەوێت چواردە سەدە لە مێژووی میللەتەكەی نەفی بكات، زۆر بە سوكی سەیری ناودارانی و هەڵكەوتوانی دەكات!

لەبەر خاتری پڕوپاگەندەی مەزهەبی شیعی و فیكری قەومی خەیاڵی، ڕقی لە سەلاحەدینی ئەیوبیە!

لەبەر پرۆپاگەندەی مەسیحی و بازنە ئیمپریالستەکان هەزاران نەفرەت دەبارێنێتە سەر سمکۆی شکاک، هەرچەندە ئەو کەڵە سەرکردەیە بوە هۆی ڕزگارکردنی بەشێکی زۆری کوردستان لە پلانێکی ئاسوری وئیمپریالی!

ڕق لە خەلافەتی دەوڵەتی عوسمانیە، بۆیە هەموو تۆمەت واتە واتی ئەرمەنەکان لە دژی کوردەکانی نێو دەوڵەتی عوسمانیشی پێ قبوڵە، نەوەك پشت ببەستێ بە دۆکیومێنتێکی ڕەسمی عوسمانی!

لە مەسەلەی ئەرمەن، بەبێ خوێندنەوەی مێژوویی و هەل ومەرجی ئەوکاتەی کێشمەکێشی دەوڵەتی عوسمانی و ڕوسیای قەیسەری لەسەر سنوری ئەنادۆڵ و ویلایاتی شەرقی کە کوردستانی باکور دەگریتەوە، یەکسەر ئیدانەی کورد دەکات و سوارەی حەمیدیش بە جاش لە قەڵەم دەدات!

ڕاستیەکەی بوونی سوارەی حەمیدیە لەو ناوچەیە ئەگەر عوسمانیەکان بۆ مەرامی سیاسی و عەسکەری خۆشیان دروستیان کردبێت، بەڵام بۆ پاراستنی کورد لەو ناوچەیەی سەر سنوری شەڕی ڕوسیا و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی زۆر گرنگ بوو.

بەڕای من هەڵەیە بڵێین سوارەی حەمیدیە جاش بوون، چونکە جاش وەك دەزانین هەردەم بۆ سەرکوتکردنی بزوتنەوەکانی ڕزگاریخوازی کورد پێکهێنراوە، هێشتا هیچ بزوتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی کوردی دروستیش نەبوبوون. سوارەی حەمیدیە کە سولتان عبدالحمید پێکی هینا لە ساڵی ١٨٩١ وەک لاسایی کردنەوەیەکی هێزی قۆزاقەکانی ڕوسیا و چەتە ئەرمەنییەکان بوون، بۆ ئەوەی بەکاریان بهینیت لە جەنگی سەر سنوور ودەستدرێژیەکانی ڕوسیا و چەتە ئەرمەنیەکان. ئەگەر کورد ئەو هێزەی نەبالە هەل ومەرجی ئەوکاتە، بۆی هەبوو بەدەستی ڕوسیا و چەتە ئەرمەنیەکان ئیبادە کرابان.

سەرکردەیەکی ڕێکخراوی هاشناق، کە ڕۆڵێکی زۆر دڕندانەیان یاریکردووە لەو خوێنڕێژیانەی نێوان کورد و ئەرمەن، خۆی بە دکتۆر هاملین ی دامەزرینەری زانکۆی ئەمریکی لە تورکیا گووتوە: ئیمە بە ئەنقەست هێرش دەکەینە سەر لادێ وشارۆچکەکانی کورد و تورک کۆمەڵکوژیان دەکەین هەتا ئەوانیش ئەرمەنەکان کۆمەڵکوژ کەن، تا ڕوسیا وخۆرئاوا تەدەخول کەن بەناوی مرۆڤایەتی و شارستانیەتی مەسیحی، کە دکتۆر هاملتن ئیدانەی ئەو پیلانەی کردوە، وەڵامی دایتەوە، تۆ نازانی چەندە سوودی هەیە وەک بولگارەکان سەربەخۆیی بە دەست دەهێنین[١] !

کۆمەڵکوژیەکەی ئەرمەنەکان لە ئەنجامی چوونە ناو یاریەکی پۆخڵی ئیمپریالیزمی خۆرئاوا و ڕوسیای قەیسەری بوو، بە دڵ و بەگیان وبە سیخوڕی و بە چەکداری لە خزمەتی پلانەکانی دەوڵەت روسیای قەیسەری بوون لە پێناو دابڕاندنی بەشێکی گەورەی خاکی کوردستان بە ديارىبەکرەوە بۆ ئەوەی دەوڵەتی ئەرمەنەکان لەسەر خاکی دێرێنی ئەرمەنەکان [بە قسەی خۆیان] دامەزرێنن !

---

[١] الطرد والابادة مصير المسلمين العثمانين لـ جستن مكارثي ل ١٣٩

بۆ زانینتان سەرەڕای هەموو هەڵە و تاوانەکانیان، من ئیدانەی ئەو کۆمەلکوژیانەی کە دژی ئەرمەن ئەنجامدران دەکەم، بەڵام بە ڕوحیەتی کەسێکی تاوانبار نا، چونکە خودی ئەرمەنەکان و دەوڵەتی ڕوسیای قەیسەری و ئینجا عوسمانی بەرپرسن لەو کۆمەڵکوژیە، رۆشنبیرە ساویلکەکانی کورد بە پشت بەستن بە قسەی موبەشیر و قەشەی توندڕەو و سەفیری وڵاتە خۆرئاواییەکان، وەك کەمال مەزهەر دەیانەوێت کورد تۆمەتبارکەن و تێوەگلینن .

هەر بۆ زانینی هەمووتان ئەو ملیۆن ونیوە قوربانیانەی ئەرمەن کە باسی دەکەن هیچ ئەساسێکی نیە، خۆیان زۆر لەوە ژمارەیان کەمتر بوون تا هێندەیان لێ بکوژرێت، دیسان هەر بۆ زانینتان چەندین گەلی موسلمان وەک لاز وتەتار و گەلانی قەوقاز بەتەوای وەك ئەرمەن لە ڕوسیا قڕکران، ئەوەی کوشتیانن کوشتیان و ئەوەی تر بەتەواوی دەرکران بۆ ناو دەولەتی عوسمانی، بەڵام چونکە موسڵمان بوون کەس باسیان ناکات.

دەبێت ئەو هەموو هەقیقەتانە بزانین ئینجا ئیدانەی کۆمەڵکوژیەکان هەمووی بکەین، بەپێی سەرچاوەیەکی ئەمریکی خۆرئاوایی ئەرمەنەکان شان بەشانی ڕوسەکان وهێزە ئیمپریالیەکان لە ساتەوەختی جەنگی جیهانی یەکەم بەپێی ئامارێکی مەیدانی وردی نوسەرێکی ئەمریکی ئستیفان شۆ ٦٠٠،٠٠٠ هەزار کورد وتورکی موسلمانیان کوشتوە[٢].

کەوابوو ئەرمەنەکان وەک نەتەوەیەکی مەسیحی بچوك، بە شێوەی ئاسوریەکانی مار شەمعون، لەناو زەریایەك موسڵمان بە چاوساغی سەرکردە دینییە جاهیل و تووندڕەوەکانیانەوە چوونە ناو یاریەکی ترسناك، زۆرترین خەڵکی موسلمانیان کوشت و لاقەکرد لە پێناو وەهمی پاراستنیان لەلایەن خۆرئاوا و ڕوسیاوە!

کە ئەوانیش پشتیان بەردان، تازە هێندە تاوانیان کردبوو، بێگومان تاوانیشیان بەرامبەر کرابووەوە، کەڵکی مانەوەیان لەوێ نەمابوو، دەوڵەتی ئیتیحاد و تەرەقی بڕیاری لەناوبردنیان دان، بەشێك کوردیش لەو کۆمەڵکوژیە بە پاڵنەری تۆڵە سەندنەوە لە کارە قێزەونەکانی ئەرمەنەکان بەژدار بوون، بۆ زانینیش ئەوکاتە بەناوی سوراەی حەمیدیە نەبوو، چونکە ئەوکاتە سولتان عبدالحمید لادرابوو. هیوادارم زیاتر مێژووی خۆمان بخوێنینەوە تا نەکەوینە کەند وکۆسپی، کەسانێکی هەڕاجکەری مێژوو و کەرامەتی کورد.
ئەو کتێبەی بەردەستت کۆمەڵێ وتارن لەکات وساتی جیاجیا نووسراون هیوادارم کەمێك لە بۆچوونە خواروخێچەکان ڕاست کاتەوە.

٢٠٢٢/٦/١

[٢] Steven Shaw , history of Ottoman Empire and modern Turkey , University of Cambridge press ,p.٢٠٢-٢٠٣ ١٩٧٩
ل١٣١، دراسات في الحركة الكردية المعاصرة ١٨٣٣-١٩٤٦ ، د. عثمان علي، اربيل ٢٠٠٢.

# كورد و ئەفسانەكانی كوشتارەكەی ئەرمەن

## بەشی یەکەم

دەیەها ساڵە ڕۆشنبیری کورد بەو پەڕی نەزانیەوە مێژوی خۆی هەڕاج دەکات وپۆزش بۆ دوژمنانی دەهێنێتەوە، بێ ئەوەی لە وردەکاری مێژوو وئەو سەردەمە گەیشتبێت.

بە داخەوە بەشێكی زۆری ڕۆشنبیری کورد وادەزانن، خۆ نیشاندان وەك کەسانێكی پێشكەوتوخواز و سێكیولار بە نەفرەت کردنەوە دێت لە هەموو كلتور و مێژووی با وباپیرانمان، دەیانەوێت بە چاویلکەی ئەمڕۆی سەدەی بیست ویەك مێژووی سەدان ساڵی کورد بخوێننەوە!

هەر بۆیەش دەیانبینیت لاوازترین وبێ ئەرزشترین خەڵکن لەناو كۆڕی ڕۆشنبیران. كەس بەقەد ئەو ڕۆشنبیرە کوردانە لە مێژوو دابڕاو و بێ بناغە و لەرزۆک نین لە بەراوردا لەگەڵ ڕۆشنبیرانی میللەتی تر، کە هەرگیز بە وا بە ئاسانی دژی مێژووی خۆیان نادوێن. چونکە حەزی بە دین نییە، دەیەوێت چواردە سەدە لە مێژووی میللەتەکەی نەفی بکات، زۆر بە سوکی سەیری ناودارانی و هەڵکەوتوانی دەکات، لەبەر خاتری پڕوپاگەندەی مەزهەبی شیعی و فیکری قەومی خەیاڵی ڕقی لە سەلاحەدینی ئەیوبیە، لەبەر پڕوپاگەندەی مەسیحی و بازنە ئیمپریالستەکان هەزاران نەفرەت دەبارێنێتە سەر سمکۆی شکاک، هەرچەندە ئەو کەڵە سەرکردەیە بوە هۆی ڕزگارکردنی بەشێكی زۆری کوردستان لە پلانێكی ئاسوری وئیمپریالی! ڕقی لە خەلافەتی دەوڵەتی عوسمانیە، بۆیەهەموو تۆمەت واتە واتی ئەرمەنەکان لە دژی کوردەکانی نێو دەوڵەتی عوسمانیش پێ قبولە!

ئەوەی لەو وتارە گرنگە لای ئیمە باسی کۆمەڵکۆژیەکەی ئەرمەنە، کە سەد ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، کەچی کورد لەو ڕۆژگارە خەریکە زۆر گەرمتر لە جینۆسایدی ئەنفالی ٢٧ ساڵەی [١٩٨٨] خۆی یادی دەکاتەوە! ئەو بەپیرچوونە گەرمەش لە ژێر کاریگەری وەهمێكی مێژووییە، گوایە ئێمەی کوردی موسڵمانی دەمارگیر، هەر لە خۆڕایی لەبەر خاتری خەلیفەی موسڵمانانی عوسمانی کوشتاری ئەرمەنە مەسیحیە ئاشتیخواز و پەپولەکانمان کردوە شان بە شانی سوپای تورك! نازانن هەتا ئەو کوشتاریە لە سەردەمی خەلافەتی عوسمانی نەبوە بەمانا هەقیقیەکەی چونکە سەردەمی حوکمی ئیتئحاد وتەرەقی بوو کە لە ساڵی ١٩٠٨ وە کودەتای کرد بەسەر خەلافەتی عوسمانی، حوکمێكی سەد دەرسەد جیای دامەزراند لە شوێنی کە سێکیولاریەتی فەرەنسی بوو!

# بەشی دووەم

## پەرۆشیەکی زێدەڕۆ لە ساویلکەییەکی لە ڕادەبەدەرەوە دێت

## پەرلەمانتارە موهەریجەکان!

کورد نابێت هێندە ساویلکانە پەرۆشی کوشتارەکەی ئەرمەن بێت، وەك کەسانێك خەریکە بیکەنە دۆزی کورد، وەك ئەو چل پەرلەمانتارەی کوردی عێراق داوای دەرهێنانی بڕیاری بە جینۆسایدی کورد دەکەن! هەرنەبێت ئەرمەنیەکان خاوەن ئەرمێنیا یەکی سەربەخۆن، دەبا ئەوان کەرەمیان کردبا، هەڵەبجە وئەنفالیان بە جینۆساید ناساندبا! بزانە بیریشیان لێکردۆتەوە؟!

لێرەدا جیاوازی نێوان ڕۆشنبیری میللەتان و فشنبیر و "ڕۆژمانە نووسانی" کورد دەردەکەوێت! ئەخر هەی فەقیر حاڵینە ئەگەر ئەمریکا و دەیەها دەوڵەتی گەورە وبەهێز لە ترسی تێکچوونی پەیوەندیەکانی لەگەل تورکیا نەوێرابن تا ئێستا باسی دان هێنان بکەن بە جینۆسایدی ئەرمەن و تورکیا دەتانەوێ کورد باسی بکات! ئەخر هەی نەزانینە نازانن لە حاڵەتی دان هێنان بەو جینۆسایدە، دان دەنێیت بە ئەرمەنستانی بوونی نیوەی کوردستانی باکوور بەپێی ئیدیعای نەتەوەپەرستە ئەرمەنەکان، کە ڕێژەیان لە چەند شارێکی کوردستان لە ١٨ %تێپەڕی نەداوە، تەنها لە وان دەگەیشتە ٣٠%؟! ئەخر هەی نەخوێندەوارینە نازانن دەبێت تا ماون سواڵ بکەین بۆ ئەوەی قەرەبووی زیانەکانی ئەرمەن بکەینەوە لە سایەی ئەو بە تاڵان بردنەی سەروەت وسامانمان!

ئاخر بۆکە کوردێك لە تورکیا و دەرەوەش کارێکی باش دەکات، هەموو جیهان دەڵێن تورکێك کارێکی باشی کرد، کەچی کاتێ کارێکی وا خراپ ڕوودەدات کوردتان بەبیر دێتەوە، هەرچەندە کورد ئەو کەمەی بەژداریشی کردبێت، بە بڕیار و پلان داڕێژتنی دەسەڵاتی تورکیەوە بووە!

کورد لە ئەرمەن کەمتر قوربانی نەبوە بە دەستی ئەرمەنەکان، دەکرێت هاوسۆزیەك نیشانیان بدەیت، لەگەل هاندانی ئەوانیش ئاور لە مێژووی خۆیان دەنەوە بە شێوەیەکی بابەتیانە.

ئەو کەمپەین و ئیمزا کۆکردنەوەی لەلایەن ڕۆشنبیر و سیاسیەکان دەکرێت بۆ مەسەلەی کوشتارەکەی ئەرمەن، زیاتر لەو لادێیە دەچێت کە لە شاردا فریو دەخوات، و هێندە فاسید دەبێت، تا کوڕی شار هەڵەیەک داوێن پێسیەك دەکات ئەو دە داوێن پیسی وهەڵە دەکات، بۆ ئەوەی گرێی هەست بە کەمکردنی قەرەبوو کاتەوە! کەسانێکی چەپرەو و تازە لیبراڵ هێندە بەپەرۆشن بۆ چەمکەکانی مافی مرۆڤ و جارِی گەردوونی مافی مرۆڤ و شتی تر،لەبەر رابردووی ئایدیۆلۆژیە سەرکوتکەرەکانیان، هەرچەندە ئەوە شتێکی خراپ نییە، بەڵام نەك وەك لادێیەکە

زیادەڕەوی تێدا بکەیت، بۆ سەلماندنی لێهاتووی خۆت لەو مەیدانە بتەوێت کورد تێوەگلێنی لە گۆبەندێك کە خوا دەزانێت چ دەرەنجامێکی تاڵی لێدەکەوێتەوە!

ئەگەر داواکردنی لێبوردن لە جینۆسایدکردنی گەلێك هێندە ئاسان با بۆ نەتەوەیەکی بێ قەوارەی سەربەخۆی وەك کورد، دەبوایە فەرەنسا بەر لە هەشتا ساڵ زیاتر داوای لێبوردنی لە جەزائیریرکان کردبا، کە فەرەنسا لانکی دیموکراتیە!

ئەگەر هێندە ئاسان با دەبوایە ئینگلستان داوای لێبوردنی لە نیوەی جیهان کردبا و کە بە سەدان هەزار کەسی لە کۆلۆنیەکانی کوشتوە!

یا دەبوایە ئەمریکای زلهێز داوای لێبوردنی لەو ملیۆنەها هیندیە سوورانە کردبا، کە ئێستا تاک وتەرایان ماوەتەوە وەك کەل وپەلی مۆزەخانەیەك نیشانی جیهانیان دەدات!

سەیر لەودایە چل پەرلەمانتاریکی کورد بەوپەڕی ساویلکەیی و بێ سەوادی سیاسی خەریکی هەڵمەتێکن بۆ دەرکردنی بڕیارێك بۆ دانهێنان بە جینۆسایدی ئەرمەن !نازانن لە کاتێکدا دەیان دەوڵەتی گەورەی دوور لە سنووری تورکیا، بە ئەمریکاوە خۆی لەو باسە دەبوێرێت، لە ترسی تێکچوونی پەیوەندیەکانیان لەگەڵ تورکیا، کەچی کوردستانێکی بێ سەربەخۆ و تەنراو بە دوژمن وناحەزان، هاوسنووری تورکیا دەیەوێت ئەو دەوڵەتە سەخڵەتبکات لە کورد و زیانێکی زۆر لە خەلکی کوردستان بدات، ئەگەر ئابلۆقەی خستە سەر!

دەستی ئێران و سیاسەتی پاشکۆیەتی بە ئاشکرا پیوە دیارە، دەنا کوردستانێک خەریکە خەڵکەکەی لەبەر بێ موجەیی وشەڕی نەگریسی داعش کە یەخەی گرتوون، ئینتیحاری جەماعی بکەن، هەقی چیە بە کوشتارەکەی ئەرمەن و دەرهێنانی یاسایەک لە پەرلەمانی کوردستانی باشوور؟ !

# سوارەی حەمیدی چ بوون؟

سەیر لەوەدایە کەسانێکی وەك کامیار سابیر و چەپرەوە هاورێکانی، لەبەر سەرقاڵ بوون بە زاراوەی قەبە قەبە وبێ ئاگا لە مێژووی کورد، دەڵێن سوارەی حەمیدیە جاش بوون، ناو لە هەر کەسێکیش دەنێن جاش کە وەک ئەوان بیر نەکەنەوە، راستیەکەی من ناڵێم پێشمەرگە بوون، جونکە هێشتا کوردایەتی بە مانا هەقیقیەکەی سەری هەڵنەدابوو، بەڵام جاشیش نەبوون وەك جاشەکانی سەدام یان ئێران یان قورەچیەکانی تورکیا، ئەوەی پێی جاش نەبن، و بەو دەبەنگیەی ئەوان ڕازی نەبێت بە سوارەی حەمیدیە ناوی دەبەن!

ڕۆشنبیری کورد بەبێ خوێندنەوەی مێژوویی و هەل ومەرجی ئەوکاتەی کێشمەکێشی دەوڵەتی عوسمانی و ڕوسیای قەیسەری لەسەر سنوری ئەنادۆڵ و ویلایاتی شەرقی کە کوردستانی باکور دەگریتەوە، یەکسەر سوارەی حەمیدیە بە جاش لە قەڵەم دەدەن !ڕاستیەکەی بوونی سوارەی حەمیدیە لەو ناوچەیە ئەگەر عوسمانیەکان بۆ مەرامی سیاسی و عەسکەری خۆشیان دروستیان کردبێت، بەڵام بۆ پاراستنی کورد لەو ناوچەیەی سەر سنوری شەڕی ڕوسیا و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی زۆر گرنگ بوو .بەڕای من هەڵەیە بڵێین سوارەی حەمیدیە جاش بوون، چونکە جاش وەك دەزانین هەردەم بۆ سەرکوتکردنی بزوتنەوەکانی ڕزگاریخوازی کورد پێکهێنراوە، هێشتا هیچ بزوتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی دروستیش نەبوبوون. سوارەی حەمیدیە کە سولتان عبدالحمید پێکی هینا لە ساڵی ١٨٩١ وەک لاسایی کردنەوەیەکی هێزی قۆزاقەکانی ڕوسیا بوون، بۆ ئەوەی بەکاریان بهینیت لە جەنگی سەر سنوور ودەستدرێژیەکانی ڕوسیا و چەتە ئەرمەنیەکان. ئەگەر کورد ئەو هێزەی نەباڵە هەل ومەرجی ئەو کاتە، بۆی هەبوو بەدەستی ڕوسیا و چەتە ئەرمەنیەکان ئیبادە کرابان.

کورد هاوڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بوو ئەو کاتە، دەوڵەت بۆی هەبوو داوایان کات بۆ سەربازیش، ئێستا پێشمەرگە بە بەشێك لە هێزی بەرگری چەکداری عێراق حسێب دەکرێت، ئایە پێشمەرگە جاشی حکومەتی عێراقە؟! ئەوەتە ئەمڕۆ هەواڵێکمان خوێندەوە کە حەشدی شەعبی دڕندە داوا دەکات پێشمەرگە ببێتە هێزێکی سەر بەو !لێرەدا نامەوێت بڵێم سوارەی حەمیدیە نمونەیی بوون لە ڕەفتارەکانیان، نەخێر زۆر هەڵە وستەمشیان دەکرد لە ئەرمەن و ئاسوری وکوردیش هەتا!

بەڵام لەو هەل ومەرجەی ئەوکاتە نەبوونی هێزێکی چەکداری وەك سوارەی حەمیدیە کوردی دەکردە پارووەکی چەوری هێزەکانی ڕوسیا و ئەرمەنەکان. سوارەی حەمیدیە نەك جاش نەبوون، بەڵکو لە ئەنجامی دان نەهێنانی کورد بە دەسەڵاتی مەرکەزیەوە دروست بوون، وە هێزێکی نیمچە نیزامی.

٢٠١٥-٠٥-٢٠ خەندان

# سوارەکانی حەمیدیە زۆر شەرافەتمەندتر بوون لە ئەردۆگانیەکان!

ئەو بابەتە لەو نوسینانەوە ئیلهامی وەرگرتوە، کە بەراورد دەکەن لە نێوان سوارەکانی حەمیدیەی دوێنێ و ئەردۆگانیەکانی ئەمرۆ. ڕاستە لە چەند ڕوێکەوە لێکچوون هەیە لە نێوانیان، بەڵام بەڕای من ئەردۆگانیەکان لە بەراوردا بە سوارەی حەمیدیە، کە لە دوو سەردەم و دوو هەل ومەرجی جیا و دوو ئاستی فەرهەنگی جیا و دوو جیهانی تەکنۆلۆژی جیا ژیاون، ئامرازی وریایی وتێگەیشتن و هەواڵ بیستن ودیتن لەو سەردەمە ئەرز وئاسمانی جیایە، لە سەردەمی سوارەی حەمیدیە، ئەو ئاستە فەرهەنگیەی ئەردۆگانیەکان تێیدان سەد پلەی لە سەرووی ئەو ئاستە فەرهەنگیەی کۆمەڵگای سوارەی حەمیدیە. کەوابوو ئەردۆگانی و سوارەی حەمیدی لە دوو کۆمەڵگای جیا و لە دوو ئاستی جیا، و دوو هەل ومەرجی جیا، و دوو ڕوئیای جیادان. بۆیە ستەم لە سوارەکانی حەمیدیە دەکەین کە لایەنگری سوڵتانی فریودەربن بە دین، چونکە سەردەمەکە سەردەمی فیکری دینی بوو، هێشتا فیکری نەتەوەیی چەکەرەی نەکردبوو.

هێشتا خەڵکەکە سەرچاوەی هەواڵیان دەمی مەلا ومزگەوت بوو، نە ڕۆژنامەیەک ونە ڕادیۆیەك نەبوو ئاگاداریان کاتەوە لەوەی ڕوو دەدات لە دەوروبەریان! ئەردۆگانیەکان لەناو جەرگەی تەقینەوەی شۆڕشی ئینفۆمیدیایین، شەڕەکانیان و خۆفرۆشیەکانیان لەسەر فەیسبوک وتویتەر و میدیا دەکەن! ئاگادارن بە هەموو دوژمنایەتیەکی ئەردۆگان دژی نەتەوەکەیان، بە هەموو کۆمەڵکوژیەکی سوڵتان ئەردۆگان دژی کورد، لە کۆبانێ و پرسوس و ئەنقەرە و دەیان شوێنیتر، بەڵام بە هوشیاریەوە جاشایەتی بۆ دەکەن، بە پاڵنەرێکی عەقیدی ساختە، کە لەسەر کێ بهێتە جێبەجێ کردن لەسەر ئەردۆگان نایەتە جیبەجێ!

ئەردۆگان ئیسلامی سیاسی ئیخوانی پۆرشی دەکات و تاس ولووسی دەکات، دەنا ئەو پیاوە بەس کۆدێکی نهێنی دەیبەستێتەوە بە تیرۆرستان و ئیسلامی سیاسی بە گشتی. هیچ یاسایەکی شەریعەت لە وڵاتی ئەردۆگان جێبەجێ ناکرێت، وڵاتێکە پراوپڕە لە تیاترۆخانە و سۆزانیخانەی ئاشکرا و نهێنی و مەیخانەی سەرجادەکانی سیاحەت، و سەرەڕای گەورەترین ڕێژەی هاوڕەگەزبازانی دنیا لەو وڵاتە هەن، بە هەموو دەزگایەکی ئاشکرایەوە! کەوابوو شەریعەت لە دەوڵەتی ئەردۆگان لە کوێیە؟!

ئەردۆگانیەکان لە سەردەمێك بەرگری لە سوڵتانە ساختەچیەکەیان دەکەن، کە هەموو نەتەوەکانی دەوروبەر خاوەنی دەوڵەت و قەوارەی سیاسی خۆیانن، بە ئاشکراش ئەو مافە بە زیاتر لە ٥٠ ملیۆن کورد بە ڕەوا نابینن! لە کاتێکدا بەرگری لەو تورکە ساختەچیە دەکەن، کە زۆربەی زۆری میللەتی تورك تەنها لەگەل بیستنی وسەی کوردستان و کورد هیستریای شێتی مانگا دەیانگرێت. ئەزموونێکی زانستی هەیە من زۆرجار ئەنجام داوە، وەرە لەبەردەم تورکێکی باش بڵێ کوردستان، ببینە دەموچاوی چی لێ دێت، چۆن نارەحەتی لەسەر ڕوخساری خۆی دەنوێنێت!

سوارەکانی حەمیدیە لە زەمەنی دواترین بەناو خیلافەتی ئیسلامی دەژیان، و بەرگریان لە وڵاتێك دەکرد تا ئەو ساتانەش هێمایەك بوو بۆ موسڵمانانی هەموو جیهان، شەریعەت پیادە دەکرا بە نیوەچڵیش بێت، خەلیفە خاوەندارێتی لە موسڵمانان دەکرد، ئەگەر بە قسەش بیت، خەڵکەکە لە سۆزی دینی بەولاوە هیچیتریان نەدەزانی، بۆیە بەڕای من سوارەکانی حەمیدیە بەو هەل ومەرجانەوە زۆر لەوانە شەرافەتمەندتر بوون، کە لەو سەردەمەی شۆرشی میدیا و ئینتەرنێتە هێشتا دوای قەزەمێکی وەك ئەردۆگان دەکەون بەو هەموو دەستی پێکرنەی بە کورد، بەو هەموو تاوانانەی ئەنجامی دەدات لە دژی کورد و دیموکراتیەت بە گشتی. سوارەکانی حەمیدیە نە ڕۆژنامەیەك و نە تەلەفزیۆن و هەتا ڕادیۆشیان نەبوو. زۆربەشیان عەشایەر ونەخوێندەوار بوون و تەژی بوون لە گیانی دینی دەمارگیر بە کاردانەوەی هێزە ئەوروپیە مەسیحیەکان و نێردە تەنشیریەکان، بەپێی سەردەم و هەل ومەرجەکە.

بۆیە دەڵێم سوارەکانی حەمیدیەی دوێنێ زۆر باشتر وپاکترن لە بەراوردا بە ئەردۆگانیەکانی ئەمرۆ.

٢٠١٥/١١/١

# کوشتاری ئەرمەن
# لە کتێبەکەی کاک نەوشێروان مستەفا [کورد وعەجەم]

کاک نەوشێروان مستەفا لەو کتێبەی [کورد وعەجەم] کە کتێبێکی مێژوویی زۆر بە نرخە باسی کێشەکانی نیوان کورد وئەرمەن دەکات، کە جۆن دەیانویست لەسەر خاکی کوردستان دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان دامەزرێنن، هەتا ئامەدی پایتەختی کوردستانشیان بە هی خۆیان دەزانی، وەك تورکمانە خەیال پلاوەکان جۆن هەر دە عائیلەیان لە شارێک و قەزایەك وناحیەك بێت دەڵێن هی تورکمانە، ونەخشەیەکیان کێشاوە هەولێر وسلیمانیشی تێکەوتوە!

ئەرمەنیش بە هەمان شێوە لە هەر شارێکی کوردی کەمینەیەکیان هەبوو بیت، یەکسەر کردویانە بە ئەرمەنی! کاک نەوشێروان باسی ڕۆڵی میدیای چەواشەکاری خۆرهەڵاتی دەکات بۆ ناوزڕاندنی کورد، و هەروەها ڕۆڵی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیتیحاد وتەرەقی بۆ ئەوەی کوشتارەکەی ئەرمەنیان بخەنە ئەستۆی کورد وەک لە ل ٢٨٨ هاتوە کە سەفیری تورکیا لە لندن تاوانی کوشتارەکەی خستۆتە ملی کورد!

دوایێ خۆش بەختانە لە ل ٢٨٩ باسی شایەتی دوو کەسایەتی بیانی دەدات لە بێ گوناهی کورد لەو کوستارەی ئەرمەنیان، یەکەمیان شایەدی سەرۆکی نوێنەرانی ئەرمەنە بۆ کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس ١٩١٩ ، بوغوس نوبار پاشا، دوەمیان شایەدی مێجەر نوئێلی گەورە ئەفسەر وسیاسی بەریتانی . هاوپێچ وینەی ئەو چەند لاپەرەیە دادەنێم بۆ سوودی زیاتر.

٢٠١٥/١٥/٢٥

# کارداشیان و خوشکەکەی کورد تۆمەتبار دەکەن!

کارداشیان وخوشکەکەی کە نە ئەکتەری گەورەن، ونە گۆرانی بێژی ناودارن، بەڵکو هەموو بەهرە وبلیمەتیان لە سمت و سنگی و لەشی ڕووت و بەرنامەی بێ پەردەیان چڕ بۆتەوە، وبازرگانی بەو بلیمەتیە جەسەدیەوە دەکەن، بێ ئەوەی هیچ لە مێژوو بزانن، یان لەوە تێبگەن جیاوازی زۆرە لە نێوان دەسەڵات و داردەست، خۆلێ کارداشیان، خوشکی کیم کارداشیان کە بەودواییە سەردانی ئەرمینیایان کردوە، لە پۆستێکدا کە لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووک بڵاویکردووەتەوە، نووسویەتی:

" سەردانی نیشتمانی دایکمان کردووە، ئەرمینیا کە سیمبۆلی ئاشتی و بەهێزییە، لێرە ئافرەتەکان چەکیان هەڵدەگرت بۆ ئەوەی هاوکاری هاوسەرەکانیان بکەن و بەرەنگاری سوپای تورکیا و هێزە کوردییە نافەرمییەکان ببنەوە."

خۆلێ کارداشیان پێیوایە، کە چەکدارانی کورد بەشدارییان لە کۆمەڵکوژییە گەورەکەی ساڵی ١٩١٥ کردووە!.

ڕاستیەکەی بەشێك لە کورد وەك داردەستێکی دەوڵەتی عوسمانی لە لەشکری حەمیدیە بەژداری کردوە، بەڵام کورد هەرگیز خاوەنی ویست وقەوارە و بڕیاری خۆی نەبووە تا لەسەر کورد حسێب بکرێت!

ئەگەر نا هەموو کوشتارەکانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی لە کۆلۆنیەکانی دەبێت بخرێتە ملی خەڵکی هیندستان، چونکە هیندیەکان زۆربەی زۆری سوپای ئیمپریالیزمی بەریتانیان پێك هێنابوو!

شتێکیتریش دەبیت ئەوانەی دەم لەو بابەتە دەدەن بزانن، ئەویش ئەوەیە چەتە ئەرمەنیەکان دەیان قەسابخانە ودەستدرێژیان کردۆتە سەر لادێ و گوندە کوردەکان، و خەڵکێکی زۆریان کوشتوە بە هاوکاری سوپایی ڕوسیا. لەبەر ئەوە خەڵک ترسی ئەوەی هەبوو ئەگەر ئەرمەنەکان سەرکەون، هەموو موسڵمانێك وەك یەك مامەڵە بکەن وقەسابخانەیان بۆ ساز بکەن، ئێمە خۆمان وەك خیزان باپیرەی گەورەمان لادێ و مولک وزێدی خۆیان بەجێهێشتوە، لە دەست چەتەکانی ئەرمەنی ڕایان کردۆتە کوردستانی باشوور!

سەرەرای ئەوەی ئیدیعای ئەرمەنی بوونی زۆربەی شارەکانی کوردستانی تورکیایان دەکرد. کورد دەبێت ئیدانەی ئەو کوشتارە و جینۆسایدەی ئەرمەنیان بکات، بەڵام نابێت لە هەمان گۆشەنیگای ئەرمەنە دەمارگرژەکان بروانێتە بابەتەکە، پیویستە گۆشەنیگای کورد بگاتە گوێیان، نابیت یەکسەر تەسلیمی ئیدیعائاتی ئەوان بن بە بەژداری کورد لەو کوشتارەی ئەرمەنیەکان، چونکە کورد وەك هێزێکی چەکداری نا نیزامی سەر بە دەوڵەت بەژداری کردوە، نەك هێزێکی نیزامی دەوڵەتێکی کوردی.

٢٠١٥/٤/١٤

# ئەتاتۆرک مامۆستای هیتلەر بوو بۆ لەناوبردنی ئەرمەن و کورد!

هیتلەر وەک مرۆڤێکی نازی عاشقی هەموو ئەزمونێکی توندوتیژ بووە، جا ئەو ئەزموونە لە دین بێت یان لە نادینی هیچ جیاوازیەکی نەبووە لای ئەوا! زۆرجار سەرسامی یەکێک ودژەکەشی دەبوو !

هیتلەر و دەستەبژێری نازی زۆر سەرسامی لایەنی جەنگاوەری و جیهاد بوون لە ئیسلامدا. زۆر ستایشی ئەو وتارە جەنگاوەرییەی ئیسلام دەکەن بۆ جەنگاوەری و موژدەی بەهەشت و ڕوباری شیر و هەنگوێن و ئافرەتی حۆری جوان! هیتلەر چەندین جار وتویەتی: ئێمەی ئەڵمان دووچاری دینێکی هەڵەی وەک مەسیحیەت بووین، دەبوایە ئیسلام دینی ئێمە بایە! هەتا هیملەر کە سەرکردەیەکی نازی هەرە نزیکی هیتلەر بوو دەڵێت: دینی جەنگاوەران دەبێ وا نێر بێ و بە زمانی دنیا قسە بکات، نەک وەک زمانی پڕ ترسنۆکی وتەمەڵی مەسیحیەت! وتارێکی تەواوم لەسەر ئەوە!
ئەو هیتلەرەی کەوا سەرسامی جەنگاوەری ئیسلام بوو، لە هەمان کاتدا سەرسامی کەسێکی فاشیستی دژەدینی وەک ئەتاتۆرک بوو، ئەویش لەبەر هەوڵە بەرجەستەکانی لە دامەزراندنەوەی ئومەتی تورکی لەڕێگای سڕینەوە و لەناوبردن و سەرکوتکردن و بەتورککردنی ئەرمەن ویۆنانی و کورد و نەتەوەکانیتر!

هەموو خەڵکی کەمێ ئاگادار بە مێژوو سەرسامی هیتلەر بە مۆسۆلینی فاشیست دەزانن، بەڵام کەم کەس ئاگاداری ئەو چیرۆکە نەوتراوەیە، کە هیتلەر تا سەرئێسقان سەرسامی ئەتاتۆرک بووە! بەڵکو دەڵێت ئەتاتۆرک مامۆستای من و مۆسۆلینیشە! ستیفان ئیهریگ لە کتێبی: ئەتاتۆرک لە ئەندێشەی نازیداAtaturk in the Nazi imagination
ئەو چیرۆکی سەرسامییە بە دووورودرێژی باس دەکات.
هیتلەر هەر زوو لە ١٩٢٠وە دەڵێت ئەتاتۆرک ئەستێرەی گەشاوەی ئەوە لە ئاسمانێکی زۆر تاریک!
هەر لە ١٩٣٨ دەڵێت قوتابی یەکەمی ئەتاتۆرک مۆسۆلینی یە، و قوتابی دووەمی هیتلەرە منم!

ئەوەی سەیرە ئێستا لە ئەڵمانیا ناوهێنانی هیتلەر و ستایشکردنی نایاساییە و مرۆڤ لەسەر سزا دەدرێ، کەچی ئەو ئەتاتۆرکە فاشیستە بۆتە بتێکی بەردەوامی ناو سیاسەت و دەوڵەتی تورکی. ناکرێ بە بیانووی سێکیولاربوونی ئەو فاشیستە قبەڵ بکەین کە دەستی سوورە بەخوێنی ملیۆنەها کورد وئەرمەن و خەڵکانیتر. بەر لە هەموو کەسێک دەبێ سێکیولارە دیقوکراتخوازەکان ئەو بتەی ئەتاتۆرک بشکێنن، ئەخر ناکرێ مامۆستای هیتلەر و مۆسۆلینی بە یاسا و دەستووریش پەسند بکرێت[3]!

**٢٠١٩/٤/١٥**

---

[3] سەرچاوە: کتێبی ئەتاتۆرك لە خەیاڵدانی نازیدا! Ataturk in the Nazi imagination

# پەیامێك بۆ كامیار سەبارەت بە كوشتاری ئەرمەن!

کورد لەبەر بێ قەوارەیی سیاسی ومێژوویی، حاڵەتێکی سایکۆلۆژی زۆر خراپی تێدا دروست بووە، کە هەردەم حەزی بە پاشکۆیەتی ئەم و ئەوەی بێگانەیە، لە خۆشیان زیاتر داکۆکیان لێدەکات. سەرکردەیەکی سەربازی پێشمەرگە بە خۆی بۆی گێڕامەوە، کاتێ لە شەڕێکی قورسدا لەگەڵ سوپای بەعس و جاش و جەیشی شەعبی، هەستی کرد چەند شەڕکەرێکی حزبێکی مارکسی بە خشپەیی کێشابوویانەوە و وون ببوون، وگووتی چووم بە دوایان لە ئەشکەوتێکی بچوکدا مەجلیسیان گەرم کردبوو باسی پێویستی یارمەتی دانی نیکاراگوایان وشوێنیتریان دەکرد! گووتی ئەمنیش لێیان بە ژوور کەوتم وگوووتم: شەرم لە خۆتان بکەنەوە جارێ کە کوردن وەرن یارمەتی کوردە فەقیرەکە بدەن، ئینجا خوا کەریمە لۆ نیکاراگوای!

دیندارەکانیشمان هەروان بە توندرەو و میانرەوەوە، توندڕەوەکان قسەی مەلایەکی عەرەب و تورک بە هەزار زانای کورد ناگۆڕنەوە، میانڕەوەکانیش وان، باس وخواز هەیە کوردێك دەیان ساڵە باسی کردوە، بەڵام لە ناکاو ناوێکی عەرەبی گوێ لێ دەبێت، کە هەمان باس دەکات پاش ئەو هەموو ماوەیەی کە کوردەکە باسی کردوە، کەچی سەرسامی عەرەبەکە دەبێت، وەك بڵێی پێشتر نەیبیستبێت!

ئەوەی وتارەکانی کامیار سابیر بخوێنێتەوە کە بەو دواییە لە داکۆکی کردنی کوێرانەی لە ئەرمەنەکان نووسی، باوەڕ ناکات ئەوە کوردێك بێت وا بەو ڕوحیەتە ئەرمەنیە قسە بکات! هەتا ئەرمەنیکیش بیخوێنێتەوە باوەڕ ناکات کوردێکی فریودراو و خۆ لێ گۆڕاو نووسیبێت! ئەو پیاوە کە دەماری چەپرەوی کۆنی بە ناوی مرۆڤایەتیەوە زیندوو بوبووەوە، لەبەر قەبول نەکردنی هیچ گفتوگۆیەك سەدان کەسی ئەنفرێند و بلۆک کردوە، هەندێکیان کە بەژداری گفتوگۆکەشیان نەکردوە، هەندێکیشیان بەس لەبەر ئەوەی لایکێکیان بۆ نوسینێکی من کردوە! هەندێکیان چونکە تەنکە ڕیشێکیان هەبووە، هەندێکیان کەسانێکی سێکیولار و لیبراڵیشن! لی تێکچوە و تانکی قەلەمەکەی چاك وخراپی لە ژێر زنجیری خۆی وردوخاش کردوە!

دەشڵێت من ئەوانەم بلۆك کردوە "کە داکۆکیی لە فاشیزم لە راسیزم دەکەن، نکۆڵیی لە جینۆسایدی ئەرمەنەکان دەکەن و چەتە ئەرمەنەکان بە تاوانبار دەزانن و پاکانە بۆ سوڵتان عەبدولحەمید و ناسیۆنالیزمەکەی ئیتیحاد و تەرەقیی دەکەن!"

لەو ئێوارە کۆڕەی ڕۆژی ٢٨/٤/ ٢٠١٥ کە بەژداربووین بە بۆنەی یادی سەد ساڵەی جێنۆسایدی ئەرمەنەکان و کۆمەڵکوژیەکەی قەڵادزە پێکەوە بەڕێوەچوو لەلایەن ڕێکخراوی Universal Peace Federation-UK

لە موداخەلەیەکی چەند خولەکیدا چەندین خاڵم وروژاند بۆ لایەنی ئەرمەنی، کە ئەوانەبوون: ئەگەر هاتوو کوردستانیش دانی بە جینۆسایدی ئەرمەنەکان. کرد، دوایی چ. ڕوودەدات؟! ڕاستە دەڵێن داوای نیوەی زیاتری کوردستانی باکوور دەکەن؟!

ئینجا گووتم ئێوە بەرلەوەی داوای دان پێداهێنان لە خەڵکی تر بکەن ئەی نابێت چاو بە مێژووی خۆتاندا بخشێننەوە، نابێت بزانن کێ ئێوەی تێوەگلاند لەو جینۆسایدە، لە قەشە و سەرکردە دینیەکانتان؟! من ناڵێم تورك ودەوڵەتی عوسمانی بێ گوناهن، نەخێر زۆریش تاوانبارن، بەڵام سەرکردە دینیەکانی ئێوەش ڕۆڵی نێگەتیڤیان نەبوو؟! کە پاڵیان بە ئێوە نا بۆ ناو ئەو بارودۆخە مەترسیدارە؟!

دوایی دوو بە دوو بە ڕێوەبەر و قسەکەری سەرەکی ئەرمەنەکانم گووت: چۆن بێ دەنگن لە سەرکردە دینیەکانیان لە ناو دەوڵەتێکی زۆربەی موسلمان و ئیسلامی، قوربانی بە میللەتیکی کەمینە دەدەن و دەدەنە پاڵ دوژمنانی دەوڵەت؟! ئەی نازانن ئەوە دەبێتە بیانویەك بۆ دەسەڵاتی دینی وسیاسی بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانە قێزەونەی کە کرا دژی ئەرمەنەکان؟!

پێیمگووت: باشە ئێوە کە باسی بەژداری کورد دەکەن لەو جینۆسایدە، نابێت بزانن کە ئەرمەنە چەکدارەکانی بەر لەشکری ڕووس چ تاوانگەلێکیان دژی کوردان ئەنجام داوە و تا تێبگەن لە کاردانەوەی بەشێك لە کورد؟!
لە خوا بەزیاد بێت ئەوەی گفتوگۆم لەگەڵ دەکرد ئەرمەنێکی رەسەن بوو، و کامیارێکی دەروێشی کورد نەبوو دەنا هەزار تۆمەتی کامیارانی بۆ ڕێز دەکردم! خودا شاهێدە ئەو پیاوە ئەکادیمیەی زانکۆکانی بەریتانیا، و ئەرمەنێکی ڕەسەن وخەمخۆری دۆزی ئەرمەنە، بەوپەڕی سنگفراوانیەوە وەڵامی پرسیارەکانی دەمەوە لەسەر سنوری کوردستان و ئەرمەنستان، بەڵام بەوپەڕی سەماحەتەوە دانی بە هەڵەکانی خۆیان هێنا لە سەرکردە دینیەکانیان و لە دەستدرێژی کردنە سەر کورد، بە منی گووت:

"بەڕێزم بۆیە گفتوگۆ گرنگە هەبێت لە نێوانمان تا لە یەکتر فێربین، ئەم ئێوارەیە تۆ وات لە من کرد بە زۆر لە قەناعەتەکانم دابچمەوە سەبارەت بە دۆزی ئەرمەن."
ببینە وەڵام و هەڵوێستی ئەرمەنێکی ڕەسەن چۆنە، و جوێن و تەشهیرەکانی کامیار سابیری دەروێشی شیعاراتەکانیش چۆنە؟! تازە ترسم لیی نەماوە منیش بەر شاڵاوی بلۆکی کەوتووم.
وێنەکە: قسەکەری ئەرمەنەکان یەکەم لە دەستی راست.

٢٠١٥/٥/٢

# ناوی سمکۆ یان ناوی مار شەمعون، کامەیان نەنگیە

ماوەیەکە چەندین مەسیحی لە کوردستان ودەرەوەی کوردستان هەرایەکی گەورەیان نایەتەوە دژی ناونانی شەقامێک لە هەوولێر بەناوی سەرکردەی مێژوویی کورد سمکۆی شکاک وبە زمانێکی زۆر زبر وپڕ لە وشەی ناشیرین قسە بەو سەرکردەیەی کورد دەڵێن گوایە موجریم وتاوانبار ودرندەیە چونکە قەدیسێکی موبارەکی وەک مار شەمعونی کاهینی ئاسوریەکانی کوشتوە!! داوا دەکەن ناوی سمکۆی شکاک لابرێت ومێژووی ئەو کەڵەپیاوە لە قوتابخانەکانیش نەخوێندرێت!!!

ئەوەش لە ئەنجامی ئەو تەساموحە گێلانەیە دێت کە حکومەتی کوردی بەرپای دەکات لە سیاسەتەکانی بەرامبەر کەمینە ئاییی ونەتەوەکان وهێندە نازیان دەکێشن خەریکە هەر کەمایەتیەک کۆمارێک لەسەر خاکی کوردستانی فیدراڵی دادەمەزرێنێت!!

ئەو تەساموحە گێلانەیە کە ئەمڕۆ کەسانێکی مەسیحی لە جیاتی بە خۆداچونەوەیان ورەخنە گرتن لە سیاسەتی ئینتیحاری مار شەمعون کە بوە داردەستی روس وئینگلیز لە دژی گەلانی ناوچەکە وپیکهێنانی جەتەی جەکداری وا درندە کە بە عیقدیکی ئایینیەوە کورد وموسلمانانیان دەکوشت لە جیاتی ئەوە ئەمڕۆ بە بەرچاوی کوردان سەدان جوێن ئاڕاستەی یەکێک لە گەورەترین سەرکردەی کوردی وەک سمکۆی شکاک دەکەن، ئەو پیاوەی مەزنەی کە مێژونوسی ناودار دکتۆر عوسمان عەلی بە ڕێوی سیاسەتی کوردی ورێبەری لە پراگتیزمیەتی حسێب دەکات. وتوانی گەورەترین پلان لە دژی خاکی کوردستان هەڵوەشێنێتەوە. ئەو سەرکردەیەی کە یەکەمین حکومەتی کوردی پێش قازی محمد یش لە مێژوودا دروست کردوە لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠ - ١٩٢٦.

ئەو تەساموحە گێلانەیە سەرکردەو نوسەر وبیرمەندی گەورەشی گرتۆتەوە، کۆلکە ڕۆشنبیرە نەتەوەپەرست وئێتیستەکانیش وەک تووتی قسەکانی ئەو سەرکردە ونوسەر وبیرمەندانە دووبارە دەکەنەوە، نازانن ئەو سەرکردە وبیرمەندە کوردانەش وەک تووتی هەموو بیروڕای نێگەتیڤی ئیستشراقی ڕووسی قەیسەری وکۆمەنستی ورۆژهەلاتناسی ئینگلیزی وخۆرئاوایی دووبارە دەکەنەوە بەبێ هیچ لێکۆڵینەوەیەک وخۆماندوو کردن وگەڕان بە دوای سەرچاوە وڕاستیەکان.

جەلال تاڵەبانی ناسراوە بە پەسنکردنی بێگانە بەسەر کورد تارەدەی ئازادکردنی فڕۆکەوانێکی عەرەبی عێراقی تاوانبار بە تاوانی کیمیابارانکردنی هەلەبجە، بۆیە ئەو لە یەکەمینی ئەو کەسانەیە کە لە کتێبی [کردستان والحرکە الکردیە] چەندین سیفەتی دزێوە دەیداتە پاڵ سمکۆی شکاک لە ژێر کاریگەری ناحەزانی کورد.

قاسملۆی بیرمەند وسەرکردەش هەمان شت دوبارە دەکاتەوە، ودکتۆر کەمال مەزهەریش کە کاری مێژووە وەک هەر کەسێکی ناپسپۆر ئیدانەی توندی سمکۆی شکاک دەکات بێ ئەوەی هیچ زیاد بکاتە سەر ئەوەی وتراوە لە بازنە ئیستشراقیەکان دەربارەی ئەو ڕوداوە. لە هەمووشیان کارەساتترە ئەو جەمال نەبەزەیە کە کەسانێک پێی دەڵێن پێغەمبەری کوردایەتی کە بەڕای من پێغەمبەری فشەکەرایەتیە لە [کوردستان وشۆڕشەکەی] وەک هەر کۆلکە ڕۆشنبیرێکی ماستاوکەر بۆ مەسیحیەکان وهێزە خۆرئاوایەکان سەرکۆنەی سەختی سمکۆی شکاک دەکات.!!

هەتا کاک نەوشێروان مستەفاش پییوایە ئەو ئەگەرەی کە دەڵیت والی تەوریز هانی سمکۆی داوە بۆ کوشتنی مار شەمعون لە بەرامبەر پاداشتد دواییش خۆی لینەکرد بە خاوەن لە هەموو لیدانەوەکانی تر زیاتر ڕێی تێدەچێت!!! [کورد وعەجەم، ل ٤١٤] بێئەوەی ئەو باگگراوەندە گەورەیەی تاوانەکانی ئاسوریەکان بخوێنێتەوە بەرامبەر کوردا ودەیەوێت بڵێت کە سمکۆ تەنها مورتەزەقێک بوە بۆ پاداشت مار شەمعونی کوشتوە.!!

ئەوەی لەو بوارەدا توانی شتێکی نوێ بخاتە سەر ئەو بابەتە وبەلکو تێکڕای مێژووی کورد، دکتۆر عوسمان عەلی یە کە لە کتێبی [الحركه الكرديه المعاصرة، ل ٣٧٧] زۆر بەوردی هۆی کوشتنی مار شەمعون دیاری دەکات کە لە کتیبی League of nations هاتوە:

"لە سەردەمی شەری جیهانی یەکەم ئاسوریەکان و ئەرمەنەکان هەرچەندە هاوڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بوون، بەڵام هەڵوێستێکی سیاسی وعەسکەری یان نیشاندا بۆ پاڵپشتی کردنی هێزە هاوپەیمانەکان لە دژی دەوڵەتی عوسمانی، هێزەی بەکرێگیراوی ئاسوریەکان بە سەرکردایەتی بوترس ئاغا بەژداری سوپای ڕوسیای کرد لە وێرانکردنی سەدان گوندی کوردی وسوتاندنی...کە ئەوەش بوە هۆی کوشتن وسەرگەردانی نزیکەی یەک ملیۆن کورد، کاتێک سوپای روسیاش لە کوردستان کشایەوە چەکەکانی دایە دەستی مورتەزەقە ئاسوریەکان، هەروەها کونسلخانەی فەرەنسی لە ئەستەبۆل یارمەتیەکی زۆری دراو وچەکی دا بە هێزی ئاسوریەکان. هێزی ئاسوریەکان گەیشتە ئاستێکی زۆر گەورە تا توانیان شاری ورمێ ودەوروبەری لە کوردستانی ئێران داگیر بکەن. چەکدارە ئاسوریەکان دەستدرێژیان کردە سەر سەدان ئافرەتی کورد لەناو شاری ورمێ، پاش ئەوەی ئامادەیەکانی هێزی ئاسوری تەواو بوون، نێوەندە ئاسوریەکان لە لەندەن وباریس، داوای دامەزراندنی قەوارەیەکی ئاسوریان دەکرد لەسەر خاکی کوردستان [ورمێ - هەکاری]."

سەیر لەوەدایە قەشەی کەنیسەی مارگۆرگیس کە کەنیسەی شۆڕشیشی پێدەڵێن، دەڵێت سمکۆ تاوانبارە، بەڵام دەربارەی مار شەمعون دەڵێت: "المرحوم باطريك كنيسه المشرق الاشورية الشهيد مار بنيامين شمعون" وەک بڵێی مار شەمعون بەس خەریکی خواپەرستی بوبێت و سمکۆ لەناو دێری عیبادەتدا کوشتبیتی!! بە پێی ئاینی مەسیحی [دع ما لله لله ودع ما لقيصر لقيصر] کەچی

قەداسەتی بەتریاک مار شەمعون لە یەک کاتدا پیاوی دینی وسەرکردەی سیاسی وسوپاییش بوو، لە یەک کاتدا لەلایەن روسیا وبەریتانیا وفەرەنسا وئیتاڵیاش یارمەتی دەدرا، هێندە بوغرا ببوون لە خۆیان بە ئاشکرا داوای دامەزراندنی قەوارەیەکی ئاسوریان دەکرد لەسەر ئەو خاکەی کاتی خۆی کە ڕایان کرد بۆی، پاش بە زەندیق کردنیان لەلایەن مجمع یان کۆڕبەندی ئەفسوس لە ساڵی ٤٣١، کە ناویان ئەو کاتە نەستوری بوو، وەک شوێنکەوتوانی نەستوری بەتریارکی قوستەنتەنیە کە بە فەرمی تەکفیر کرا لەلایەن مەجمەعی افسوس.

سمکۆی شکاک پاش دەستدرێژیەکانیان بۆسەر خەلکی سەدان گوندی کورد وکوردەکانی ورمێ بە هەستی بلیمەتی خۆی زانی کە ئەو مار شەمعونە پلانێکی ڕەشی نەگریسی لە دەستدایە بە پاڵپشتی هەموو وڵاتە هاوپەیمانەکان بۆ دابڕاندنی بەشێکی گرنگی کوردستان ولەناوبردنی ئەو وەک لە چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ مستەفا یامولکیش ئاماژەی پێدەکات.

لەو ناوە ڕۆڵی تیکدەرانەی نێردە تەبشیریەکان زۆر کاریگەر بوو لەسەر فوتیکردنە گیانی دەمارگیری دینی لەو ناوچەیە هەستیارە دەیەها قوتابخانە ونەخۆشخانە وچاپخانە وپەرستگایان کردەوە بۆ ئاسوریەکان وەک نەوشیروان دەڵێت: "میسیۆنەرەکان دەورێکی کاریگەریان هەبوو لە هاندانی ئاسوریەان لە دژی گەلە موسلمانەکانی دراوسێیان، بە تایبەتی دژی گەلی کورد کە نەخۆی دەوڵەتی تایبەتی خۆی هەبوو، وە نەهیچ دەوڵەتێکی بێگانەش پشتیوانی لێدەکرد" کورد وعەجەم، ل٣٢٥.
کاتێ بەدرخان داوای داوای لە مار شەمعون کرد هاریکاریان بن لە دژ تورکدا، لەژێر کایگەری میسیۆنەرەکانی ئینگلیز، مار شەمعون لە جیاتی هاریکاری داوای لە بابی عالی عوسمانی کرد سەرکوتیان بکەن، تا ئەو هاندانە شەڕیکی خویناوی لێکەوتەوە لە نیوان کورد و ئاسوری لە ١٨٤٢ -١٨٤٣.

هەزاران ئاسوری بە دەستی حکومەتی ئیتحاد وتەرەقی تورکی کوژران وقەتلوعام کران لە ئەنجامی دانەپاڵی روسیا لە شەری جیهانی یەکەم، پاش ئەوەی مار شەمعون داوای لە ئاسوریەکان کرد بچنە ریزی سوپای روسیاوە. لە ئەنجامی کورتبینی سەرکردایەتی کەهنوتی دەرەبەگانەی مار شەمعون هاموو ئاسوریەکان ناچاربوون بە کۆمەڵ کۆچ بکەن لە هەکاری بەرەو سنوری ئیران، ئاسوریەکان وئەرمەنیەکان ببونە پێشەنگی سوپای روسی دەستیان لە هیچ تاونیک دژی ئاوایەکانی کورد نەدەپاراست. لە کاتی کۆچی بە کۆمەڵی ئاسوریەکان لە هەکاری بۆ سەر سنوری ئیرانی ژیر دەستی سوپای روس لە ئابی ١٩١٥ "بە درێژایی ریگە توشی شەر وپێکادان بون. ئاسوریەکان لە کشانەوەدا درێخیان لە کوشتنی بە کۆمەڵی کورد و تالآنی ئاژەڵ ودارایی وکاول کردنی گوندەکانیان نەکرد. شەڕ رەنگی شەریکی دینی خویناوی بە خۆیەوە گرتبوو، هیچیان دەستی لەوی تر نە ئەپاراست وهەر گەلەیان ئەیویست گەلەکەی تر لە ڕەگ وڕیشە دەربهێنێ." کورد وعەجەم، ل ٣٥٧.

کەوابوو مار شەمعون وچەتەکانی دەبێ ئیدانە بکرێن نەک سمکۆی شکاک بە شەیتان بکرێت وناوی شەقامەکە بگۆڕدریت لەلایەن بەرپرسێکی شارەوانی کە زۆر جاهیلانە بە سایتێکی مەسیحی دەڵێت: نەمدازانی ئەو پیاوە واتە سمکۆ دەستی سورە بەخوێنی ێتاوانان!! دەستی سورە بە خوێنی تاوانباران لەسەرووی هەمویانەوە مار شەمعون وبوترس ئاغا کە بە هەزاران کوردیان کوشتوە وهەزاران ژنی کوردیان لاقە کردوە، ڕاستیەکەی ئەگەر ئەو مەسیحیانە بیانەوێت بابەتیانە بەخۆیان دابچنەوە جارێکی تر نەبنە داردەستی هێزەکانی دەرەوە وپەند لە مێژوو وەرگرن دەبێت ئیدانەی خۆفرۆشیەکانی مار شەمعون بکەن وهەموو ناو شەمعونەکان بگۆڕن نەک بیکەنە شەهیدی بەرِ وبەحری کەربەلا.

# کەنیزەی ئەرمەنی کورد و کەنیزەی ئێزدی داعش لە ڕۆمانێکی فەرەنسیدا

لە کتێبی کورد: توێژینەوەیەکی سۆسیۆلۆژی باسیلی نیکتین، لەو بەشەی باسی پایەی ئافرەت لەناو کورددا دەکات، پاش زۆر ستایشکردنی پیاوی کورد سەبارەت بە ڕەفتاری لە تەك ئافرەتدا، ئەو ئازادییەی کە ئافرەتی کورد هەیبووە لە چاو ئافرەتانیتری ناوچەکە، و دەڵێت پیاوی کورد زۆر بە ڕەوشتی سوارچاکی و جەنتڵمان و مێرخاسیەوە مامەڵەی ئافرەت دەکەن... مەلا محمودی بایەزیدیش نمونەی زۆر دەهێنێتەوە لەسەر ئەو ڕێزە تایبەتەی کە کورد بۆ ئافرەتی هەیە، و دەڵێت زۆرجار کێشە وشەڕ ببێت لە نێوان دوو هۆز و لایەنی کورد کە ئافرەت چووە نێوانیان یان شێخێك و مەلایەك، شەڕەکە دەوەستێنن. ئافرەتەکە ئەگەر دەسەسڕی خۆی فڕێدایە نێوان گۆڕەپانەکە، هەردوولا لە شەڕ دەوەستن دەمەودەست!

ڕۆژهەڵاتناسی هۆڵەندی و کۆردۆژیکی بەناوبانگ ڤان مارتن برۆنسن سەرەڕای ڕەخنەی زۆری لە کۆمەڵگای کوردی، دەڵێت هەرچەندە کورد کۆمەڵگایەکی باوکسالار ونێرسالار بوو، لە کۆندا بەڵام ئەو ڕێزە تایبەتەی کە هەیبوو بۆ ئافرەت دەکرێت بڵێین دیاردەیەك بوو بۆ خۆی!
باسیلی نیکتین ئاماژە بە خانمێکی فەرەنسی چیرۆکنووس دەکات بە ناوی [پۆل هنری بۆردۆ] لە چیرۆکێکی بەناوبانگ بەناوی [ئەنترامی ترابزۆنی] ”L’immortelle de Trébizonde“
باسی داستانێکی خشەویستی هەقیقی زۆر سەیر دەکات لە نێوان کچێکی ئەرمەنی بە کەنیزەکراو لەلایەن جەندرمەکانی تورك کە دەیفرۆشنەوە بە پیاوێکی کورد، و کچەکە بەو شێوەیە چیرۆکی کۆیلایەتی خۆی دەگێڕێتەوە:

"من چی بووم بە نسبەت ئەو کوردە؟ کەنیزەك؟ خزمەتکار؟ میوان؟ بۆچی منی کڕی؟ ئەو مرۆڤە سەرەتاییە هەستێکی قووڵی بە مێرخاسی سروشتی تێدایە... ماڵەکەی ئافرەتێکی تێدا نەبوو، ئەی ئەو هەموو ڕێزەی بۆ ئافرەت لە کوێ هێناوە؟ ئەو ڕێزەی وەختە بڵێم هەر بوونی نییە لەناو گەلانی ئیسلامی تردا؟

" من ئەو پیاوەم خۆشت ویست کە هیچیشم دەربارەی نەدەزانی، بەڵکو من هەتا زمان و مێژووی گەلەکەیشم نەدەزانی."
" بەیانیەکەی لە خەوی هەلساندم و دەستی گرتم بە نەرمی و لەگەڵ خۆیدا دەیخولاندمەوە بە دەوری ئاگرەکە، دیارە ئەو نەریتی خۆیان بوو. کاتێك کچێك شوو دەکات بەو جۆرە ماڵی باوکی جێ دەهێڵێت.
پاش چەند ساتێك من و دایەنەکەمی بانگ کرد بۆ حەوشی ماڵەکەی، سەد سەر مەڕ و پێنج گامێشی لەوێ کۆکردبوەوە، و گووتی: دەبوایە ئەو شتانەم وەك نەختی تۆ بدایە باوکت، بەڵام من ئێستا دەیدەم بە دایەنەکەت کە لەگەڵت هاتووە، وەك نەختی هاوسەرگیریمان. زۆر بە

شادومانیەکی ئاشکراوە سەیری دەکردم. هەڵبەتە کەس ناچاری نەکردبوو کارێکی وا بکات، بەڵام دەیویست بۆ هەموو خەڵکی نیشان بدات کە ئەو ئەو ئافرەتە بێگانەیەی تەنها بۆ ڕابواردنێکی جەستەیی بێ نرخ ڕانەگرتووە لە ماڵەکەی، بەڵکو منی وەك هاوسەرێکی شەرعی نیشان دا تا هەموو خەڵکیتر ڕێزم لێ بگرن. زۆر کاریگەر بوو بۆ من!

پاش هەفتەیەك گوێم لە دەنگ وهەرا بوو لە دەرەوەی ماڵ، بینیم کۆمەڵێک ئاژەڵیتری هێناوە و گووتی دەبوایە پاش هاوسەرگیری سەردانی ماڵی باوکت کردبا و ئەوانیش ئەو ئاژەڵانەت پێشکەش بکەن بە دیاری، بەڵام ئەوە ئەمن لە جیاتی ئەوان دیاریت دەکەم بەپێی داب و نەرێتمان، چونکە نامەوێت لە ژنەکانیتر هەژارتر دەرکەویت!"

ڕۆژگار تێپەڕی منالێکمان بوو، هێدی هێدی گەشەی دەکرد لە نێوانماندا. منالەکە یەك تاقە وشەی کوردیش قسەی نەدەکرد، وەك هەر منداڵێکی ئەرمەنی بوو، هیچ ڕۆژێك بێزاربوونی لەو وەزعە نیشان نەدەدا، تەنها ڕۆژێکیان پێی گووتم: بەلایەنی کەمەوە فێری وشەی [بابە] ی بکە! بەڵام ئەو ئاواتەیشم نەهێنایە دی! ئەو بەختیارییە هێشتا لە نێوانماندایە لەپاش چوار ساڵ هاوەسەرگیریمان."

وەرە ئەو ڕەفتارە بەراوردکە لەگەڵ داعشەکانی شەرمەزاری مێژوو، چۆن دەستدرێژیان کردە سەر خوشکانی ئێزدیمان، هەتا منداڵی ٩ ساڵەشیان نەپاراست لەو دەستدرێژیانە، یەکێك لەو ڕزگاربووانەی خوشکانی ئێزدیمان تەمەن ١٤ ساڵە دەڵێت: لای کوڕ وباوکێك بووم، کوڕەکەی بەردەوام دەستدرێژی دەکردە سەرم، کە سەگ تۆپ بوو کوژرا، ئینجا باوکی دەستدرێژی دەکردە سەرم! ئەوانە لە چ قوڕێك دروستکراون، ئەکید لە قوڕی ناو گواو!

کچەکە لە زانکۆی سلێمانی سیمنارەکەی پێشکەش کرد و گووتی کاتێ ژنێکی بە تەمەنی ٦٥ ساڵەم دیت، بەردەوام دەگریا، کە پرسیم بۆ دەگرییت؟! گووتی: منداڵێکی هەرزەکاری داعش بەردەوام دەستدرێژی کردۆتە سەر ئافرەتێك لەوانەیە لە تەمەنی دایکی گەورەتر بێت!

ڕاستە کۆیلەیی هەر کۆیلەییە و بە هیچ پێوەرێك قبوڵکراو نییە، بەڵام بڕوانە ئەو دوو حاڵەتە ئینجا لە مرۆیی کوردەکە و نامرۆیی داعشەکان تێدەگەیت! ئەو چیرۆکە زۆر دەنگی دایەوە جارێکیتریش لە ساڵی ٢٠١٥ چاپکرایەوە، خۆزگە ئەوەی فەرەنسی دەزانی وەریگێڕابایە سەر کوردی، من وێنەی ڕۆمانەکە دادەنێم، سوپاس بۆ باسیلی نیکتین کە ئاگاداری کردینەوە بەو شاکارە، کە ڕەوشتی سوارچاکانە و مرۆڤدۆستانەی کورد دەردەخات.

وێنەی ڕۆمانەکە دابنێ

٢٠١٩/٢/١٧

# ئەرمەن لە گێڕانەوەی عبدالرزاق بەدرخان دا!

## بەشی یەکەم

هەموو ساڵێك یادی کوشتاری ئەرمەن لە ناو کورد دەکرێتەوە وەک بڵێی کورد خاوەنی دۆزەکە بن، وبێ ئەوەی بە قووڵی بەو باسەدا بچن، وکەمێك خۆیان ماندووکەن شتێ زیاتر بخوێنەوە، بۆ بینینی گۆشەیەکی تر لەو باسەدا. هەندێ بەناو ڕۆشنبیری کورد زۆر بە سەخاوەتەوە کورد تۆمەتبار دەکەن بە هەموو کارەساتێکی مێژووی کۆن و نوێ وەك بڵێی کورد خاوەنی ئیمپراتۆریەتێک بووبن بڕیاری سیاسی ناوچەکە بەدەستی ئەوان بێت! نازانن کورد میلەتیکی بێ دەسەڵات وبەنجبووی بە خوراڕافاتی دین و ڕێچکە سۆفیەکان بوون، بە ئاسانترین شیوە فریودەدران! ئێستاش سەرۆکێکی تورکی لە چاخی ئەتۆم و ئینتەرنێت و شۆڕشی زانیاری، بە دنیایەك عەیب و عار و مەلها و گەشتوگوزاری سێکسییەوە توانای فریودانی کوردێکی موسڵمانی زۆری هەیە، ئەی دەبێت ئەو کاتانە خەلیفە چ ڕەمزێکی موقەدەس بوو بێت بۆ کورد؟!

جگە لەوەش جارێکیتر سیاسی وبەناو ڕۆشنبیری کورد لە ژێر کاریگەری ئایدیۆلۆژیا و دین و بانگەشەی وڵاتە زلەکان، هیچ لە جەور و ستەمی میللەتانیتر نابینێت لە دژی کورد، تەنها کاردانەوەی خۆی دەبینێت لە دژی جەور وستەمی ئەوان! بە تایبەت ئەگەر ئەو میللەتانە لە ئەنجامی هەڵەپاسی و ستەمی خۆیان نەتەوەیەکی گەورەتر و بەهێزتریان لێ ڕاست هاتبێت وەك کورد بێ وەی و بەبەزەیی نەبووبن لەگەڵیاندا! لە باسی کوشتاری ئەرمەندا سەدان بەڵگەنامەی ڕووسی و ئەمریکی و ئینگلیزی، ئەوە باسی عوسمانییەکانیش لەولاوە بوەستێ، هەن کە ئاماژە دەکەن بەو تاوانانەی چەتە و منداڵکوژەکانی مورتەزەقەی ئەرمەن ئەنجامیان داوە لە دژی کورد، بە پاڵپشتی چەک و هێزی ڕوسیای قەیسەری مەسیحی لە هەر شوێنیك تیایدا باڵا دەست بوون.

من دەتوانم سەدان بەڵگەی ئەو ئەرشیفانە بهێنمەوە، بەلام گەورەترین بەڵگە لای من بەڵگەکانی میللەتی خۆمانە، بۆیە بەڵگەکانی عەبدولڕەزاق بەدرخانی کوڕی نەجیب پاشای کوڕی میر بەدرخانی بۆتان، بۆ من لە هەموو بەڵگەکانی ڕووسی وئەمرکی و عوسمانی گرنگترە، چونکە عەبدولڕەزاق بەدرخانی لەناو گۆڕەپانەکە بوو وەك کەسێکی سیاسی و ڕابەری عەسکەری وهەزاران چەکداری کورد لەگەڵی بوون. عەبدولڕەزاق بەدرخان مرۆڤێکی خەباتگێڕ وماندوونەناس بوو، تەنها خەمێکی ڕزگاری وئازادی کورد بوو، دۆستی سەرەکی رووسیا بوو، نزیکترین کەس بوو بۆ دڵی ئەرمەنەکان، کە پەیوەندیەکی زۆر باشی لەگەڵیان هەبوو .

لەو کتێبەدا کە لە ئەرشیفی ڕووسیدا پارێزراوبوو [ژینامەی عەبدولڕەزاق بەدرخان][٤] بۆت دەردەکەوێت کە عەبدولڕەزاق بەدرخان سەرەڕای ڕێز وخۆشەویستی و دۆستایەتی ڕاستگۆیانەی بۆ ئەرمەن، جەنگانی لە دژی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی ئەوسا، وکوژاندنەوەی هەزاران فیتنە و ئاشووب لە نێوان کورد و کورد و کورد وئەرمەندا، هێشتا ئەرمەنەکان بەردەوام لە دژیدا کاریان دەکرد، وسەرئێشەیان بۆ دروست دەکرد، هانی پلەدارە سەربازییە بەرزەکانی ڕووسیایان دەدا لە دژیدا، تا کار بەوە گەیشت خۆشی کەوتە ژێر هێرشی چەتە ئەرمەنییەکان بە پاڵپشتی ڕووسەکان ناچار بە خۆ بەدەستەوەدان کرا، ئەگەر ئەفسەرێکی ناسیاوی خۆی لەوێ نەبا دەشیانکوشت!

ئەو پیاوە خەباتگێڕە زۆر ڕاشکاوانە باسی پەیوەندی خۆی و بنەماڵە ناودارەکەی بەدرخان دەکات لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، چۆن خەلیفە سوڵتان عبدالحمید هەموو کەس وکاری دەگرێت ونەفییان دەکات بۆ تەڕابلوس پایتەختی لیبیای ئێستا، و چۆن هەتا هاتنی حکومەتی ئیتیحاد وتەڕەقی یش سەرەڕای ئازاد کردنی بوڵغار وئەرمەن و هەموو ڕەگەزەکانی تر، هێشتا ماڵباتی بەدرخان لە زیندان دەهێڵنەوە بۆ هەڤدە مانگ زیاتر! ل٣٩
دوای گەڕانەوەی بۆ تورکیا دەڵێ هەستم بەوە کرد کە ژیانمان لە مەترسیدایە، بۆیە عەبدولڕەزاق بەدرخان ڕادەکات بۆ ڕووسیا و داوا دەکات ڕووسیا لێیگەڕێ بە هێمنی بژیت لە سەرزەمینیدا و خەریکی کار وباری خۆی بێت!

ئەوەی لای من گرنگە ئەوەیە عەبدولڕەزاق بەدرخان کە تۆمەتبار دەکرا بە پیاوی ڕووسیا، و هاوکاریکردنی سەربازی لەگەڵیدا، و سەرەڕای ئاسۆفراوانی و کرانەوەی بەسەر ئەرمەنەکان، بەڵام چۆن باسی ئەرمەنەکان دەکات؟! لەکاتێکدا کە ئەو ژینامەیەی لەناو دەسەڵاتی ڕووسەکان نووسیوە، زۆر ئازایانە باسی ڕووسەکان و ئەرمەنەکان دەکات، نەك وەك هەندێ سەرکردەی ئاخیرزەمانی مارکسی وماوی کورد، کەشین بۆ مارشەمعونی ئاسووری دەگێڕێ، و سمکۆی شکاک دەداتە بەر نەفرەت بەوپەڕی بێ کەڕامەتی و دوور لە واقیعی مێژوویدا.

ئەرمەنەکان لەلایەن پیاوێک [عەبدولڕەزاق بەدرخان] کە لە یەك بەرەبوون لە دژی عوسمانییەکان بە جۆرێك باس دەکرێت دەزانیت کە ئەرمەنەکان فریشتە نەبوون وەك هەندێ فشنبیر شەو و ڕۆژ بانگەشەی بۆ دەکەن! خەڵکانێکی دەمارگرژی دینی مەسیحی بوون، تا سەرئێسقان دڵڕەق و پڕ قەسوەت و موجریم بوون، هەندێ لە سەرکردە چەتەکانیان شانازیان بە کوشتنی منداڵی سەر بێشکەش کردووە! تا ماندوو بوون کوشتاریان لە کورد وباقی نەتەوەکانیتر کردووە لە پەنا سوپای ڕووسەکان، هەتا زۆرجاران ڕووسەکانیشیان ئیحراج دەکرد بە تاوانەکانیان، هەرچەندە ڕووسەکانیش بە پاڵنەری دینی چاوپۆشیان لێ دەکردن.

---

[٤] سەرچاوە:
عبدالرزاق بدرخان [ السيرة الشخصية ] ترجمة دلاور زنكي، من اصدارات مجلة هافيبون – ١ الطبعة الاولى ١٩٩٩، المانيا – برلين

نامەویێ هیچیتر باس بکەم لێدەگەڕێین خودی عەبدولڕەزاق کوڕی میر بەدرخان مەزن بدویێ:
لە سەرەتادا دەلێت من خاوەنی ئەو کتێبەم ناوم عەبدولڕەزاق کوڕی خوالێخۆشبوو نەجیب پاشام کوڕی نۆبەرەی باوکی میر بەدرخان [میری جزیره وبۆتان]. من لە تەمەنی ٤٦ ساڵیم.
من زۆر ئەزیەتم دەخوارد کە دەمدیت حکومەتی تورکی بەتەواوی گەلی کوردیفەرامۆش کردوە، وگوێی پێ نادا وژیانی ئەوانی لا بێ ئەرزشە، هەرچەندە کورد میللەتێکی بە سروشت وریا و زیرەکە و حەزی بە مەدەنیەت و شارستانییە، و قابیلیەتی پێشکەوتن و باڵابوونی لە زۆر میللەتانیتر زیاتر تێدایە. لە منداڵییەوە باوەڕێك لە میشکم چەسپابوو کە ڕووسیا ئاواتی هەرە گەورەی ئێمەیە وخەونی میللەتی کورد تەنها لەسەر دەستی ڕووسیای نزیك لە ئێمە دێتە دی، نەك لەسەر دەستی کەسانیتر، بۆیەش من ئێستا لە [بەتلیسم].
ل ٤٠

عەبدولڕەزاق بەدرخان دەڵێت: بروسکەیەکم ناردرا بۆ وەزارەتی دەرەوە بۆ ئیمپراتۆری ڕووسیا کە من بۆیە لەگەڵ ئەوانم تا هەموو خزمەت وتواناياکم بەگەڕ بخەم بۆ تێکشکانی کۆت وبەندی تورکی و دامەزراندنی کوردستانی ئۆتۆنۆمی لە ژێر چاودێری رووسیدا. ل٤٣
لە جێگایەکیتر دەڵێت لە یەکەم ساتەوە بە هەموو بەرپرس وکەسایەتییە ڕووسەکانم گوتوە کە ئەو خزمەتانەی پێشکەشی دەکەم بە رووسیا تەنها لە پێناو پێشکەوتن و بەرزبوونی میللەتەکەمە،" ل ٥٩

ئەوە ئامانجی سەرەکی عەبدولڕەزاق بەدرخان بوو لە پەیوەندیدا لەگەل ڕووسیا، کە ڕزگارکردنی کوردستان بوو بەرەو سەربەخۆیی بە یارمەتی ڕووسیا.
عەبدولڕەزاق بەدرخان باسی ئامانجەکانی دەکات و لە نێویاندا دەڵی: "دامەزراندنی ئەنجوومەنی هاوبەش لە نێوان کورد وئەرمەن بۆ نەهێشتنی هەر رِق و بوغزێک و باشترکردنی نێوانیان و بلاوکردنەوەی خۆشەویستی وتەبایی." ل٦٠

لە ل ٧٤ دەڵێت: "کە هەواڵی گەیشتنی [دیرۆ]م بە کیفیر شامان پێگەیشت لەگەڵ ٣٠٠ چەکداری، کوردەکانی ئەوێم دلنیا کردەوە کە هیچ ترسیکی نییە، وهۆکارێکیش نییە بۆ ترسان وەك من وامدەزانی، بەڵام کاتێ مەلای گوند بەرەو پێشوازیان چوو وەك کاوڕ سەریان بڕی، ودوایی بە نێزەی چەکەکانیان هەشت خێزانی کوردیان بە گەورە وبچووکەوە کوشتبوو. دیرۆ فەرماندەی گشتی هێزەکانی ئەرمەن بوو خۆبەخشانە بەژداری شەڕەکانی دەکرد!

لە ل ٧٥ دەڵێت: جارێکیان ئەفسەرێکی ڕووسی لەگەڵ وەرگێڕەکەی هاتنە لام بۆ وتوێژ دەربارەی چەك، لە کاتی گفتوگۆکاندا وەرگێڕەکە خۆی لە وتووێژەکان هەڵدەقورتاند! کاتێ پێیم گووت تۆ هەقی خۆ تێ هەڵقورتاندنت نییە، دەمانچەکەی راکیشا بە ڕووم و هەڕەشەی لێکردم، و گووتی من ئەفسەرێکی ژەنەڕال [شتابی]م لە سوپای ئەرمەنی!
تۆ بروانە درِندەیی تا ئەو حەدە، وەرگێڕێك دەمانچە لە سەرکردەی گەلێك ڕاکێشێ بەبەرچاوی ڕووسەکان، دەبێ ئەو چەتە چەکدارانە چۆن مامەڵەی کوردە ئاساییەکانیان کردبێ؟!

# ئەرمەن نوسخەی مەسیحی داعش

## بەشی دووەم

لەو بەشە بۆت دەردەکەوێ کە ئەرمەنەکان هەتا بەرامبەر ئەو کوردانەش باش نەبوون کە بە دڵ وبەگیان پاراستنیان لێدەکردن لە دژی تورك. لە چەندین شوێن ئەوە ڕوویداوە پاش ئەوەی کورد ئەرمەنی پاراستوە لە مەترسی، لە یەکەم فورسەتدا ئەرمەنەکان دەستیان کردوە بە کوشتنی کوردەکان! ئەرمەنەکان لەناو سوپای ڕووسی کە هەموو وەرگێڕەکانیان لەوان بوون، هەمیشە دڵی بەرپرسە گەورەکانی سوپایان کرمی دەکرد لە دژی عەبدولڕەزاق بەدرخان و کورد بە گشتی! هەتا بە درۆ وهەڵبەستن چەندین گوندی بێوەی کوردیان دایە بەر تۆپی ڕووسی .عەبدولڕەزاق بەدرخان دەڵێ بەرپرسە گەورەکانی سوپای ڕووسی هەموویان زۆر پەستبوون لەو درۆ هەڵبەستنە و بوهتانەنەی ئەرمەنەکان لە دژی کورد هەڵیان دەبەستن، کە ئەوانیان خستۆتە هەڵەی گەورەوە.

لە هەمووی قێزەونتر ئەرمەنەکان وەك داعش لە زۆر لەو غەدرانەی دەیانکرد لە دژی خەڵکی کوردی مەدەنی وبێ چەك، پاش قەتل وعام وتاڵانی سامانیان کۆمەڵێ کچ وژنی کوردیان وەك سەبایا و جاریە دەبرد لەگەڵ خۆیان! ئێستا دەبێ باشتر تێبگەین بۆ هەندێ لە کوردەکان وا داخدار ببوون لە ئەرمەنەکان، چونکە چەتە ئەرمەنەکان هیچ تاوانێك نەمابوو ئەنجامی نەدەن لە دژی ئەو کوردانەی کە دژی دەوڵەتی تورکیش بوون، ئەی دەبێ چۆن بووبن بەرامبەر ئەوانەی لەگەڵ دەوڵەت بوون؟! هەتا کاتێ پێنج لە ئاغاکانی سەر بە سوارەی حەمیدییە ڕادەکەنە لای بەرەی ڕووسەکان، لە جیاتی ڕێزگرتنیان بە تەحریزی چەتە ئەرمەنەکان، ڕووسەکان ئەوپەڕی سوکایەتیان پێدەکەن!

# وەفا و ڕەوشتی کورد و غەدری ئەرمەن!

با بێینە سەر گێڕانەوەکان: "بەر لە چەند ڕۆژێك بەر لە دەرچوونی یەکەمی کۆلۆنێل [نالکییف] بۆ داگیرکردنی [باشکالی] کورد نەك هیچ خراپەیەکیان دەرهەق بە ئەرمەن نەبوو، بەڵکوبەرگریان لێکردن بە گیان و ڕوحی خۆیان، کاتێ هێرشیان کرایە سەر لەلایەن چەتە وڕێگر ودزی تورك بۆ تاڵانکردنی مولک وسامانیان.

بەڵام پاش داگیرکردنی [باشکالی] ئەرمەنەکان هێرشیان کردە سەر هەندی لە ماڵەکانی کورد تاڵانیان کردن و چەندین تاوانی کوشتنیشیان ئەنجام دا، بەڵام کە تورکەکان سەرلەنوێ خاکەکەیان داگیرکردەوە، و کۆنترۆڵی شارەکەیان کردەوە کوردەکان تۆڵەیان سەندەوە لە ئەرمەن بە تاڵان وکوشتنیان، ناچاربوون ڕایان کردە ڕووسیا.

بڕوانە لە کاتێکدا ئەرمەنەکان دەستیان لەو کوردانەش نەدەپاراست کە شەڕی مان ونەمانیان بۆ پاراستنی ئەرمەنەکان کردبوو، کەچی عەبدولڕەزاق بەدرخان پاش ئەو هەوڵەی کوشتنی خۆی وسمکۆش لە ڕێگای دەرچوونی لە خوی بۆ زیفی تووشی ژمارەیەکی زۆری خێزانە ئەرمەنی وئاسووریەکان دەبێ، کە لە ورمێ وسەلماس ڕایان کردبوو بەرەو ڕووسیا قۆلگا دەچوون، ئەوان شپرزە و تۆقیو بوون، هەر لەو ناوەش چەتە ئەرمەنەکان دەیان گووندی فارسەکانیان سوتاندبوو گڕ و دووکەڵیان دیار بوو، بەڵام نەك عەبدولڕەزاق بەدرخان هیچ کارێکی خراپی دەرهەقیان نەکرد بەڵکو یارمەتیشی دان. ل٨٧-٨٨

هەر دوای ئەوە عەبدولڕەزاق بەدرخان دەڵێ ":لە ڕیگادا پیاو و ژن و منداڵی ئەرمەنیمان دەدیت کە ڕایان کردبوو لە قەسابخانەی گووندی [خۆریک] بۆ ڕزگارکردنی گیانیان. منیش یارمەتیم دان و زگم پێ سوتانەوە ئاژەڵم بۆ پەیدا کردن تا سواری بن بگەن بە شاری بیبێژك بە یاوەری سوارچاکەکانی خۆم. هەڕەشەی توندیشم لە کوردی ناوچەکە کرد کە نابێ هیچ کارێکی خراپ دژی ئەرمەن بکەن و زیانیان پێ بگەینن. ئەو کارەش سەرنجی قەشەکانی بیبێژك ی ڕاکێشا بوو، بۆیە نامەی سوپاسگوزاریان بۆ نووسیم " .ل٨٨-٨٩

"بە زەحمەتێکی زۆرەوە لە شاری وان دەرچووین و گەیشتینە ئاڤزین لە ناوچەی کوروندەشت. لەوێ لە هەندێ سەربازی ئەرمەنمان زانی کە پیاوانی دینی ئەو ناوچانە پشتگیری ئەرمەنەکانیان کردبوو و ڕزگاریان کردبوون لە قەسابخانە، بۆیە سوپاسیان دەکەن. وەك پێزانینێك ئەرمەنی نیشتەجێی ناوچەکە پەیمانیان بە کوردانی نیشتەجێی ناوچەکە دابوو کە پشتیان بگرن ونەهێڵن ڕووسەکان دەستدرێژیان بکەنە سەر، زۆریان لێکردبوون کە ناوچەکە بەجێ نەهێڵن. کوردەکان باوەڕیان بە پەیمانەکانیان کردبوو و لە ماڵ وشوێنی خۆیان مابوونەوە. بەڵام کە چەتە لۆکاڵییە

ئەرمەنییەکانی ناوخۆ گەیشتبونە ناوچەی کوروندەشت، گوێیان بە تکا ورجای برایانیان لە ئەرمەنەکان نەدابوو بە توندترین شێوە دەستیان کردە کوشتنی کوردەکان .سەربازەکان ماڵێکیان نیشان دام کە ٦٠ لاشەی مردووی لێبوو، لە گوندێکیتر ٨٠٠ لاشەی لێبوو. هەندێ لە لەو کوردانەی کە لە ژێر فەرماندەیی من دابوون چوون لاشەکانیان ناشت بەپێی رێ وشوێنە ئاینیەکان." ل-١٠٦-١٠٧١٠٧

# ئەرمەنەکان نوسخەی مەسیحی داعش بوون!

عەبدولڕەزاق بەدرخان لە چەندین شوێن بە حەسرەتەوە باسی دەستدرێژی سێکسی و بردنی ژن و کچی کورد وەك کەنیزەک وسەبایا لەلایەن ئەرمەنەکان دەکات. نازانم ئەو مەسیحیانە چۆن فێری ئەو ڕەوشتە نزمە ببوون، لە کاتێکدا ئەگەر موسڵمانیش بان دەمانگووت ڕەنگە لەژێر کاریگەری توراس وکلتوری فیقهی ئیسلامی فێربووبن !

داعشبوونی ئەرمەنەکان هەر لە بردنی ئافرەتی کورد بە کەنیزەك دەرناکەوێت، بەڵکو لە کۆی رەفتار وکار وبیری چەپەڵ و دڕەندەیان دەردەکەوێت. لە سەربڕینی خەڵکی کوردی بێ تاوان و لە کوشتنی منداڵ وپیری بێ تاوان و لە تاڵان ودزی و بە بێ نرخ تەماشاکردنی گیانی مرۆڤ دەردەکەوێت. هێندە تونووی خوێن بوون هەتا دەستیان لەو کوردانەش نەدەپاراست کە هەزاران ئەرمەنیان لە مردن ڕزگار کردبوو! من دڵنیام لە توندوتیژی داعشیشیان تێپەڕاندبوو چونکە لە ژێر دنەدانی قەشە وپیاوانی دەمارگرژی ئاینی بوون و پشتیان بەهێز بوو بە ڕووسیا، وایاندەزانی رووسیا تا هەتاهەتایی ڕزگاریان دەکات ودەیانپارێزێت، ئەوەش ئەوپەڕی کورتبینی وبێ عەقلی سەرکردە دەمارگرژە ئاینییەکانیان بوو، بۆیە من لە کۆڕێک ڕوو بە ڕوو ڕەخنەم لە ئەرمەنەکان وسەرکردەکانیان گرت کە چۆن ئەوگەلە بچوکەیان لە چاو تورك و کورد دووچاری ئەو دوژمنایەتیە گەورەیە کرد!

عەبدولڕەزاق بەدرخان دەڵێت: "لە گوندی چوبوکلۆ ڕۆیشتین بەرەو گوندی مەلا حەسەنی .چیاکان بەرامبەرمان بوون بەڵام دیمان ٢٠٠٠ خێزانی کورد بارگەیان لەو ناوە خستبوو، کە لە گوندەکانیان ڕایان کردبوو. کە هەواڵی گەیشتنم بەوێ پێیان گەیشتبوو سەد نەفەریان هاتن بۆ لام گووتیان کە ژەنەڕال ترۆخین لەو ناوە بوو نامەیەکی بۆ نووسین کە ئەوانە بێ تاوانن نابێ کەس بە خراپ دەستیان بۆ درێژکات. ئینجا چەکەکانیان لێیان داماڵیبوون. کە ژەنەڕاڵ لەوێ ڕۆیشتبوو، ئەرمەنەکان هێرشیان کردبوونە سەر وبەناچاری ڕایان کردبوو لە گوندەکانیان .٢٧ کچ وژن لە ماڵباتە خانەدانەکان خۆیان کوشت بە خۆ هەڵدانە دۆڵێك پاش ئەوەی دەستدرێژی سێکسیان کرابوە سەر...لە گوندی میندان کاتێ ئەرمەنی هەمان گوند هێرشیان کردبوە سەر ماڵی ئەیوب بەگ ژنەکانیان بە کەنیزەک بردبوون، پیاوەکان و خزمەتکارەکانیشیان کوشتبوون، کەسیان نەهێشتبوەوە، هەموومولک و سامانیانیس تاڵان کردبوون ".ل١٠٢ و ١٠٣

لەلایەکیتر مورتەزەقە و چەتە خۆبەخشەکانی ئەرمەن کاتێ ئامادەکاریان دەکرد بۆ دەرچوون لە لە [کوتور] ٢٧٠ کەسیان لە خەڵکی کورد کوشت لە مناڵ و ژن، مەڕ وماڵاتیان و مولکیان تاڵان کردن، هەتا چەندین کچیان [وەک کەنیزەك] بە پێشەخۆیان دادان. ئەوەی هەواڵی ئەو قەسابخانە و تاوانانەیان پێدام هەندێ لەوانە بوون کە بە چاوی خۆیان بینی بوویان وەك:هۆرکێل حاکمی

کاراباخ و باروجیك ئیڤانۆڤ [لە تیمی سەربازی پێنجەمی ڕووسی] و کابتن بلاتونۆف لە تیمی هەشتەم و خەڵکانیتریش ...ئینجا ئاگریان لە خانوو و کەلوپولەکانی گوندەکە بەردا بوو و بۆی دەرچوو بوون." ل ٨٢-٨٣ ئەرمەن لە گێڕانەوەی عبدالرزاق بەدرخان دا!

# بەشی سێیەم

## هەوڵی کوشتنی عەبدولڕەزاق بەدرخان!

هەموو لاپەڕەیەکی ئەو کتێبەی عەبدولڕەزاق بەدرخان ئاماژەیەکی ڕاشکاو و ناڕاشکاوی تێدایە بۆ ئەو سەرئێشانەی ئەرمەن دروستیان دەکرد بۆ تێکڕای کورد، وەهەتا ئەو کوردانەی وەك عەبدولڕەزاق بەدرخان و پیاوەکانی لە یەك بەرە شەڕیان دەکرد لە دژی یەك دوژمنی هاوبەش! ئەو دەستدرێژیانەی ئەرمەن گەیشتە ئەو ڕادەیەی مەترسی لەسەر ژیانی خودی عەبدولڕەزاق بەدرخانیش دروست بکەن و بە موعجیزە ڕزگاری بێت لە ئاگربارانی چەتە ئەرمەن و سەربازە ڕووسەکان!

عەبدولڕەزاق بەدرخان بەدرێژی باسی ڕوداوێکی چەتە ئەرمەنییەکان دەکات و دەڵێت: "جارێکیتر کاتێ پیاوەکانم بە ئەرکی پاسەوانی خۆیان هەڵدەستان، پێیان گووتم ئەرمەنە خۆبەخشەکانی بەرەی جەنگ هەوڵی دزینی ئەسپەکانمانیان دا. یەکسەر پەیوەندیم کرد بە ژەنەڕاڵ چیرنۆزۆبۆف ئەو دەستدرێژیانەم پێی ڕاگەیاند، و تکام لێکرد سنورێکی بۆ دابنێ. پاسەوانەکان سێ بوون دوویان دوایان کەوتن، سێیەمیان لە پاسەوانی مایەوە، شەڕەکە لە نزیک قوتابخانەکە دەستی پێکرد، سەربازە ڕووسەکان پشتگیری چەتە ئەرمەنیەکانیان کرد، ویەکێ لە پاسەوانەکانیان کوشتم ناوی [عەلۆ] بوو، ئەوەی تریان سەرباز وچەتەکان دوای کەوتن ئەویش بەرەو قوتابخانەکە هات کە بارەگای ئێمە بوو.

لەو کاتانەدا چەتە خۆبەخشەکانی ئەرمەن چوار ئەسپیتریان لێ دزین. کاتێ پاسەوانەکە گەیشتە قوتابخانەکە، پەنای بردە بەرمان و گووتی سەربازە ڕووسەکان وئەرمەنەکان بەدواوەمن بۆ ئێرە و هەوڵی لەناوبردنی هەمووما ن دەدەن. یەکسەر پێنج تفەنگ بە دەست ڕایان کردە دەروازەی قوتابخانەکە بۆ پاراستنی دەرگای قوتابخانەکە، لەوکاتەدا شەڕە گوللە دەستی پێکرد.

کابتن بلاتونۆف کە دەمناسی، لە نزیك شوێنەکەی ئێمە سەربازگەی داخستبوو کاتێ گوێی لە دەنگی تەقە ببوو، نەیدەزانی من لە قوتابخانەکەم کە وەك بارەگا بەکارم دەهێنا، فەرمانی بە سەربازەکانی کردبوو بچنە سەر بانەکانەوە و گوللە بارانمان بکەن، بە قەزیفەش لێیان دەداین لە پەنجەرەکانەوە. بۆ پاراستنی جەستەمان لە ئاگر پەنامان بۆ ئەو دیوارانەی نێوان پەنجەرەکان دەبرد، ئینجا فەرمانم بە پیاوەکانم کرد تەقە نەکەن بەڵکو دڵیان کەمێ داکەتبێت ئەوانیش ڕاوەستن. بەڵام تەقە وئاگر بەردەوام بوو.

لە هەوڵێکی نائومێدانە نزیك بوومەوە لە پەنجەرەیەك دەستم دەرهێنا بە دەسەسڕەکەم ئاماژەم بۆ دەکردن و هەندێ وشەی ڕووسیش کە دەمزانین بە دەنگی بەرز دەگووتەوە. ویستم تێیان گەیەنم کە ئێمە دوژمن نین، داوام لێکردن ئەفسەرەکەیان بانگ بکەن. بەڵام گوللە بارانیان بەردەوام بوو بێ ئەوەی بەرم کەون. سەربازەکان جنێویان پێ دەدام و دەیانگووت وەرە دەرەوە.

منیش بە ناچاری دەرچووم بۆ هەیوانەکە، کاتێ منیان دیت جلی ئەورووپیم لەبەرە، هیچیتر تەقەیان نەکرد و چەکیان کردین. لەو کاتەدا گوێمان لە دەرگا لێدان بوو کاتێ کردمانەوە دیتم بردەرێکی ڕووسیم بوو [بارۆژیک فیتالیس]. کە منی ناسیەوە فەرمانی کرد بە وەستانی هەموو شتێك.

لە ئێوارە کاتێ چووم بۆ سەردانی ژەنەراڵ چیرنۆزۆبۆف، زۆر شەرمەزار بوو لەوەی ڕوویدا بوو. پەیمانی پێدام بە دەرکردنی فەرمانێك بۆ لە سێدارەدانی ئەو ئەرمەنانەی تێوەگلابوون لەو ڕووداوە و گەڕاندنەوەی ئەو ئەسپانەی کە دزیبوویان..." ل٨٤-٨٥
هەتا سمکۆی شکاک کە هیچ کێشەیەکی لەگەڵ ئەرمەن نەبوو لە دەستدرێژی ئەرمەنەکان ڕزگاری نەبوو. ئەو سمکۆیەی شوهرەتی ئازایی وبەهێزی هەتا دەوڵەتەکانی نیگەران کردبوو، کەچی ئەرمەن لەبەر بوغرابوون بە پاڵپشتی ڕووسەکان، بەبێ هۆ تەنها لەبەر ڕقیان لە کورد ئەویشیان کردە دوژمنی خۆیان! عەبدولڕەزاق بەدرخان دەگێڕێتەوە: " سمکۆ [ی شکاک] ئەو کاتە لە شاری [خوی] بوو، ژەنەراڵ ڕێگای پێدا بە کۆچکردن بەرەو ڕووسیا بە خێزان و پیاو و موڵک وسامانیەوە، کە لە خوی دەرکەوتبوو ئەرمەنەکان دابوویانە بەر دەستڕێژی گوللەکانیان. لەپاش ڕووداوەکەی قوتابخانەکە دەنگۆی کوژرانی من و سمکۆ بە دەستی ئەرمەنەکان بڵاوبوبوەوە." ل ٨٧

# ئەرمەن کوردە داماوەکان تێوەدەگلێنن!

عەبدولڕەزاق بەدرخان لەبارەی خەباسەتی وەرگێڕ وچەتە ئەرمەنیەکانەوە دەڵێت: "گوندە کوردیەکان بە دەنگی تۆپ بارانی ئەرمەنەکان بە خەبەر هاتن، هەندێ کەس لە چیای ئاراراتەوە گوللەیان لە سەربازە رووسەکان دەگرت، هەر ڕووداوێکی تەقەکردن ڕوویاندابایە، وەرگێڕە ئەرمەنەکان ڕۆڵێکی خراپیان دەبینی بۆ تاوانبارکردنی خەڵکی گووندنشینی بەدبەختی کورد کە هیچ تاوانێکیان نەبوو، هەموویان لە ژێر دەسەلاتی سەربازی ڕووسی بوون. زۆربەی ئەفسەرە ڕووسەکان ڕەخنەیان لە ئەرمەن دەگرت زۆر زیاتر لە کورد، چونکە بە ئەزموون بۆیان دەرکەوتبوو کە ئەرمەن درۆزن و و بوهتانچین، بۆیە من هەمیشە پێشنیارم بۆ دەکردن کە ئەفسەرەکان وەرگێڕەکانیان لە نێو کوردی سونەیی یەریڤان و قارس هەڵبژێرن. لە ڕاستیدا پێشنیاری منیان قبوڵ بوو بەڵام بە کردار جێبەجێیان نەدەکرد." ل ٩٠

سەرەڕای ئەو غەدر وخیانەت و داعشیەتەی ئەرمەنیش هێشتا دڵی کوردانەی عەبدولڕەزاق بەدرخان هێشتا لە هەموو هەلێکدا ئەوپەڕی جوامێری دەنوێنێت بەرامبەر ئەرمەنەکاندا.

ئینجا عەبدولڕەزاق بەدرخان باسی چەتەیەکی ناوداری ئەرمەن دەکات و دەڵێت: لاتۆ کە شۆڕشگێڕێکی ئەرمەنی ناوداره ویستی بەسەر گوندی [بێداری] لە گوندەکانی بەروارییەکان دابدا، خۆی و بیست و حەوت لە پیاوەکانی بە دەستی کوردەکان کوژران. کوردەکان باقی چەتە ئەرمەنیەکانیان ڕاونابوون هەتا شاری موکس و سێ گوندیان سوتاندبوون.

دوایی عەبدولڕەزاق بەدرخان دیسان باسی هەڵوێستێکی پڕ لە جوامێری کوردانەی خۆی دەکات بەرامبەر ئەرمەن، ودەڵێت: بەرلەوەی بگەڕێمەوە بۆتان، بە ڕەسمی بڕیاردرا کە سوپای ڕووسی لە وان دەکشێنەوە، کاتێ خەڵک گوێی لەو هەواڵە بوو شارەکەیان جێدەهێشت وڕایان دەکرد ، ئەو کاتە ٢٧ ئەسپم لابوو هەموویم بەخشیە ماڵباتە ئەرمەنی و کلدانییەکان و خۆشم لەگەڵ کۆچبەران کۆچم کرد." ل١١٤- ١١٥

سەیرم بەوە دێت بەڕێز کەمال مەزهەر لە کتێبی کردستان في سنوات الحرب العالمیة الأولی- ل٢٤٧ دا دەڵێت ئەرمەنەکان لە کورد زۆر پێشکەوتوتر بوون! چەند لێکدانەوەیەکی کرچی مارکسی دەکات بۆ سەلماندنی ئەو پێشکەوتنەی ئەرمەن! بەڵام بەڕای من ئاستی پێشکەوتنی هەر گەلێك دەبێت لە بیر وکردار و کاردانەوەی ئەو میللەتە ڕەنگ بداتەوە. دەبێت لە ئاستی شارستانی و ڕۆشنبیری و لێبوردەیی و مرۆڤایەتی ڕەنگبداتەوە. لە هەمووش گرنگتر ئاستی ژیری ئەو گەلە ڕەنگبداتەوە.

دەبێ چ ژیری و پێشکەوتنێك لە تێکڕای ڕەفتار وکرداری ئەرمەن لەو سەردەمەدا بەدیبکرێت؟! بێیت لەبەر هەڵەی چەند سوارەیەکی حەمیدی و دەرەبەگ و سەرۆک هۆزی کورد، هێرش بکەیتە سەر هەموو کورد و بەوپەڕی قەسوەتەوە بیانکوژیت، هەتا دەست لە دۆستەکانی خۆشت نەپارێزیت؟!
بابڵێین دەرەبەگی کورد کاتی خۆی بە دنەدانی دەوڵەتی تورك، ستەمی زۆری لە جوتیاری ئەرمەن کربوو، بەڕاستیش ستەمیان زۆر کردبوو، بۆیە ئەرمەن ئەو ڕق وقینەیان هەبوو، بەڵام خۆ هەمان ستەم دەکرا دژی جوتیاری کوردی موسڵمان، وەك لە بەڵگەنامە ئەرمەنیەکانیش هاتوە لە کتێبەکەی کەمال مەزهەر.

بۆ دەبێ ئەو ڕق وقینە ئاڕاستەی هەموو کورد بکرێ، بەو کوردە هەژارانەوەش کە وەک هەژاری ئەرمەن دەچەوسێندرایەوە و ستەمیان لێدەکرا؟! بۆ دەبێ سەدان هەزار جوتیار و خێزانە هەژارەکانیان بکوژیت، و مەڕو ماڵاتیان بە تاڵان ببەیت و ئاگر لە ماڵیان بەردەیت، لەبەر ستەمی دەرەبەگ و خاوەن زەوییە نامرۆڤەکان؟! بابڵێین بەشێك لە کورد دواکەوتوو بوو پیلانەکەی بەسەردا تێپەڕی، بەڵام ئەرمەن کە گوایە پێشکەوتوتر بوون لە کورد بۆ پیلانەکەیان بەسەر تێپەڕی؟!

کەمال مەزهەر دەڵێ ئەرمەنەکان پێش ئەمریکاش ڕۆژنامەیان دەرکردوە، باشە ئەگەر وا بلیمەتن بۆ ئاگاداری ئەو پیلانە دەوڵەتی ونێودەوڵەتیە نەبوون بۆ تێکبەردانی ئەرمەن و کورد وتێکدانی پەیوەندییە مێژوویە باشەکەیان لەلایەن دەوڵەتی تورك و ئەڵمانیا و بەریتانیا و نێردە مەسیحییە تەبشیرییەکان!

لە کاتێکدا شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری ڕابەری شۆڕشی ١٨٨٠ دەڵێ: "تورکەکان دەیانەوێ ئێمەی کورد بەکاربهێنن تەنها بۆ چەوساندنەوەی برا مەسیحیەکانمان، کە مەسیحییەکانان لەناوبرد، ئینجا نۆرەی ئێمە دێ بۆ چەوساندنەوە"
بە بۆنەی کەمال مەزهەر و کتێبە بەناوبانگەکەی لە وتاری داهاتووم هەڵسەنگاندنێک بۆ بەشێکی کتێبەکە کە تایبەتە بە کوشتاری ئەرمەن دەکەین، دەردەکەوێت کە چۆن نا هاوسەنگ نووسراوە و پڕیەتی لە چەواشەکاری.

٢٠٢٠/٥/٢

# کەمال مەزهەر و فەرامۆشکردنی خوێنی ڕژاوی کورد! کتێبی: کوردستان لە ساڵانی جەنگی جیهانی یەکەمدا

## بەشی یەک لە دوو

بێگومان کتێبەکەی کەمال مەزهەر [کوردستان لە ساڵانی جەنگی جیهانی یەکەمدا] نرخی خۆی هەیە لە باسی کێشەی کورد وئەرمەن، بەڵام زۆر سۆڤیەتیانە نووسراوە و کورد تیایدا هەمیشە لە هەڵوێستی بەرگری و تاوانباری دایە، هەرچەندە لە کۆتایی باسی هەندێ هەڵوێستی جوامێرانەی کورد دەکات لە ڕزگارکردنی ئەرمەن لە مەرگ. ئەو کتێبە بۆ خوێنەرێك بە چاوێکی تیژی ڕەخنەییەوە بیخوێنێتەوە زۆر بە سوودە، بەڵام بۆ خوێنەرێکی ئاسایی زۆر زیانبەخشیشە. چونکە هەست دەکەیت نووسەر سنورێکی بۆ دانراوە، یان بۆ خۆی دایناوە ناوێرێ لێی تێپەڕێ. کتێبەکە پاش خوێندنەوەی خوێنەری کوردی ئاسایی دەگەیەنێتە ئەو قەناعەتەی کە کورد میللەتێکی دەستدرێژیکەر ودز و تاڵانچین، بێ هۆ کوشتاری ئەرمەنەکانیان کردوە، دەبێت تا ماوە ئارەقەی شەرمەزاری بڕژێنێت وهەر داوای لێبوردن بکات لە ئەرمەنەکان، و لە چاکترین حالەتدا پاسا وبیانوویان بۆ بهێنێتەوە. بۆیەش دەبینی زۆرینەی چینی خوێندەواری کورد بە ڕوانگەی ئەو کتێبە سۆڤیەتی میزاجە هەڵوێست وەردەگرێت لەو دۆزە هەستیارە.

# هۆکارەکانی دژایەتی ئەرمەن و کورد
## جیاوازی دین

کەمال مەزهەر کە باسی هۆکاری ناکۆکی نێوان کورد وئەرمەن دەکات دەڵێ دین یەکێك بوو لەو هۆکارانەی ناکۆکی دەخستە نێوان هەردوو گەلەکە. ئەوە ڕاستە چونکە دین لەناو خودی خۆیدا ناکۆکی دروست دەکات لە نێوان مەزهەبەکانی خۆی، زۆرجار دەگاتە دوژمنایەتی وخوێنڕژتن، ئەی چۆن ناکۆکی لەگەڵ دینەکانیتر دروست ناکات؟! زۆر لە دینداری کورد و ئەرمەن بە پاڵنەری ڕقی دینی یەکتریان دەکوشت.

ئێستا خەڵک هەیە ئەردۆگان بە خەلیفە دەبینێ، دەبێ لەو سەردەمەی دواکەوتنەدا هەندێ دەروێش و دێوانەی کورد چۆن خەلیفەی عوسمانیان تەقدیس کردبێ، بە تایبەتی سوڵتان عەبدولحەمید کە لە ئەردۆگان زۆر فێڵبازتر وخەبیستر بوو بۆ یاریکردن بە هەست و سۆزی دینی خەلک بە خراپترین شێوە .

جگە لەوەش پیاوانی دینی ئەرمەن هەمیشە لە ڕیزی یەکەمی تووندڕەوان بوون، هەمیشە سەرکردایەتی هەموو جموجۆڵێکی سیاسی و نەتەوەییان دەکرد. قەشە و ماشە ئەرمەنییەکان ڕۆڵێکی زۆر نێگەتیڤیان هەبوو لەو هێرش و قەسابخانانەی ئەرمەن کە دژی کورد و موسڵمانانی تریان ئەنجامیان دەدا. ئینجا پیاوانی کەنیسەی ئەرمەنی ڕۆڵێکی زۆر قێزەونیان هەبوو لە بەدناوکردنی کورد لە ئەورووپا و جیهان، وڵات بە وڵات و شار بە شار دەگەڕان بۆ باسی خراپی کورد کردن و هەتا خەلیفە و تورکیان لە بیرچوبوەوە!

# پێشکەوتوویی ئەرمەن و دواکەوتوویی کورد!

بەڕێز کەمال مەزهەر لە کردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى- ل٢٤٧، لە باسی هۆکارێکیتر دا دەڵێت ئەرمەنەکان لە کورد زۆر پێشکەوتوتر بوون، چونکە ئەوان پێش کورد قۆناغی بەندایەتیان بڕیبوو و گەیشتنە بازاڕی سەرمایەداری! من باسی ئەو لێکدانەوە مارکسیە کاڵ و کرچە ناکەم، بەڵام بەڕای من ئاستی پێشکەوتنی هەر گەلێك دەبێت لە بیر وکردار و کاردانەوەی ئەو میللەتە ڕەنگ بداتەوە .

دەبێت لە ئاستی شارستانی و ڕۆشنبیری و لێبوردەیی و مرۆڤایەتی ڕەنگبداتەوە. کورد سەرەڕای دواکەوتن وپەرتەوازەیشی هێشتا هەڵگری هەندێ سیفات بوون، کە پێشکەوتوترین گەلانی دنیا پێیان ناگەیشتن. بۆ نمونە لێبوردەیی و ڕەوشتی سوارچاکی جەنگاوەری ودەستپاراستن لە ئافرەت و منداڵ و پیر و هەتا پیاوی بێ چەك.

کورد هەرگیز ڕۆژێ وەك ئەرمەن نەچوونەتە گوندێکی ئەرمەن یان تورك یان عەرەب یان فارس ژن و منداڵی سی ساڵە تا ١٢ ساڵە وپیرەمێرد بە جیا لە ژورێك کەن و بە زیندوویی ئاگریان تێپەردەن، کە ئەو کارە چەپەڵە سەدان جار لەسەر دەستی چەتە ئەرمەنە دەمارگرژەکان دووبارە بۆتەوە. چەکداری کورد قەت زگی ئافرەتی سکپڕیان هەڵنەزڕاندوە هەر بۆ گرەوکردن لەگەڵ هاوڕێیەکەی بزانن کوڕی لە زگدایە یان کچ! کە دۆکیومێنتەکان دەڵێن ئەو یاریە وەك پشووی جەنگاوەرە ئەرمەنیەکان بوو لە هەر شوێنێك دەستیان پێی گەیشتبا، هەتا سەربازە ڕووسەکانیشیان فێرکردبوو.

یاریەکیتر پیرەژن و پیرەمێردەکانیان دەکردە نیشانە! هەزاران فەزائیعی تر کە مرۆڤ قێزی لە مرۆڤایەتی خۆی دەبێتەوە کاتێ دەیبیستێ وەك بڕینی مەمکی ئافرەتانی هەموو گوندەکە و بڕینی ئەندامی نێرینەی منداڵی کورد لە ٣ ساڵی بەسەرەوە وشتیتریش ناتوانم بیڵێم!.
هۆکاری ڕقی ئەستووری ئەرمەن!

کاتێ ئەرمەن وەک گەلێکی بچوك و مەسیحی ڕیسك دەکات بە دنەدانی پیاوانی کەنیسە ولە هەموو شەڕەکانی ڕووسیا و دەوڵەتی عوسمانی بە چەك وتفاق و زانیاری و چاوساغیەوە دەداتە پاڵ ڕووسیا، و ڕووسیاش لەو زنجیرە شەڕانە سەرکەوتوو دەبێت، چۆن دەوڵەتێکی گەورەی وەك عوسمانی کە تورکێك حوکمی دەکات تۆڵەی خۆی ناستێنێ لێیان؟!

کوشتارەکانی سوڵتان عەبدولحەمید لە ئەرمەنەکان هەمووی لە تۆڵەی ئەو دانەپاڵەی ئەرمەنەکان بۆ ڕووسیا، و خەلیفەی تورك چەند دەرەبەگی دەبەنگ وچڵێس و مشەخۆری کوردیشیان بەکار دەهێنا و تێوەدەگلاند لەو کوشتارانە، بۆ ئەوەی کورد وئەرمەن قەت تەبا نەبن، بەڵام ئەوەش لەبیر نەکەین بەر لەو مێژووە ئەرمەنەکان ببوونە پیاوی خەلیفە لە دژی کورد جەنگان بۆ ڕوخاندنی

ئیماراتە نیمچە سەربەخۆکانی کورد، سەرەڕای ئەوەی هیچ کێشەیەکی ئەوتۆ نەبوو لە نێوانی ئەوان و کورد!

بابڵێین دەرەبەگی کورد کاتی خۆی بە دنەدانی دەوڵەتی تورك، ستەمی زۆری لە جوتیاری ئەرمەن کربوو، بەڕاستیش ستەمیان زۆر کردبوو، بۆیە ئەرمەن ئەو ڕق وقینەیان هەبوو، بەڵام خۆ هەمان ستەم دەکرا دژی جوتیاری کوردی موسڵمان، وەك لە بەڵگەنامە ئەرمەنیەکانیش هاتوە لە کتێبەکەی کەمال مەزهەر. بۆ دەبێ ئەو ڕق وقینە ئاڕاستەی هەموو کورد بکرێ، بەو کوردە هەژارانەوەش کە وەک هەژاری ئەرمەن دەچەوسێندرایەوە و ستەمیان لێدەکرا؟ !

بۆ دەبێ سەدان هەزار جوتیار و خێزانە هەژارەکانیان بکوژیت، و مەڕو ماڵاتیان بە تاڵان ببەیت و ئاگر لە ماڵیان بەردەیت، لەبەر ستەمی دەرەبەگ و خاوەن زەوییە نامرۆڤەکان؟! کورد سەدان هەزار سەربازی سەدامی کەوتە ژێردەستی، سەرباز نەک ئافرەت و منداڵ، بۆچی نەیانی کوشتن؟! جونکە دەیزانی ئەو سەربازانە بەزۆر هاتوون و نەوێراون ڕاکەن لە سەربازی !

بابڵێین کورد دواکەوتوو بوو پیلانەکەی بەسەردا تێپەڕی، بەڵام ئەرمەن کە پێشکەوتوتر بوون لە کورد وەک کەمال مەزهەر دەڵێ، بۆ دەبێ ئەرمەنەکان دەست لە هەژار و جوتیار وچەوساوەی کوردیش نەپارێزن کە ٩٥٪ زیاتر بوون، لەبەرخاتری ڕێژەیەکی کەمی دەرەبەگی نامرۆڤی کورد قەسابخانە بۆ هەموو هەژاری کورد دامەزرێنن؟! ئێمە چی لەو زیرەکی وپێشکەوتنە بکەین کە ئەرمەنەکان نەیانتوانی جیاوازی چەند دەرەبەگێك و تەواوی میللەتی هەژار و چەوساوەی دەستی دەوڵەت و دەرەبەگی کورد بکەن.

## ٢

# پیلانی لێکدانی کورد وئەرمەن کێ جێبەجێی کرد؟!

بەکارهێنانی کورد بۆ لێدانی ئەرمەن پیلانێکی دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئیتیحاد وتەرەقیش بوو لە پاش کودەتاکەیان لە ١٩٠٨. بەڵگەنامەی زۆریش هەیە لەو بارە هەتا لەو کتێبەی بەڕێز کەمال مەزهەریش هەندێکی باسکراوە. نەک هەر پیلانێکی دەوڵەتی تورك بوو، بەڵکو هەتا ئەڵمانیای مەسیحیش ئەو پێشنیارەی بۆ تورکەکان کردبوو بۆ لێدانی ئەرمەن بە کورد، لە دژی دانە پاڵی ئەرمەن بە ڕووسیا.

بەڵام دیسان دەڵێمەوە ئەوەی باشتر یارمەتی جێبەجێکردنی ئەو پیلانانەیان دا، هەڵوێستی نەزان و دڕندانەی ئەرمەنەکان بوو، کە بە کورترین ماوە توانیان هەموو کوردێك بکەنە دوژمنی خۆیان، پاش ئەنجامدانی هەزاران کوشت وکوشتار دژی ژن ومنداڵ وپیر و پیاوی کوردی بێ چەك، لە سایەی سوپای داگیرکەری ڕووسیا، هەتا کەمال مەزهەر ئاماژە بەوە دەکات کە وەفدی کوردی کە هاتبوون بۆ پێشوازی سوپای ڕووسی لە بایەزید، ئەرمەنەکان بەبەرچاوی ڕووسەکان هەموویان کوشتن! ئنجا باسی قەسابخانەی ڕواندوز دەکات لە حوزەیرانی ١٩١٦ بە دەستی ئەرمەن و مەسیحییە نەستوریەکان، لە ل٢٩٦-٢٩٨. دەڵێ پێنج هەزار ژن و منداڵ و پیاوی کوردیان کوشت، دوایی لە پەراوێزدا دەڵێ ئەو ژمارەیە زێدەڕۆیی لێکراوە ڕاست نییە!

بەداخەوە کەمال مەزهەری لە توڵ وعەرزی کتێبەکەی تەنها لە چەند لاپەڕەیەك بە شەرمنی باسی کوژراوەکانی کورد دەکات نەک باسی تاوانەکانی ئەرمەن، خۆزگە ئەویشی باس نەکردبا چونکە بە خراپ دەشکێنەوە سەر کوردا! دەڵێ لەکاتی قەسابخانەی یەکەم لە ناوچەیەك ١٠٠ کورد کوژران بەهۆی بەرگری نەبەردانەی ئەرمەن لە خۆیان، یانی کورد تەعەداکەر و هێرشکەربوون! دوایی دەڵێ لە دیاربەکر ١٩٥ موسڵمان کوژران بە کوردیشەوە، بەڵام ٧٠ دانەیان بەدەستی خۆیان کوژرابوون لەبەر ناکۆکی لەسەر تالان! یانی کوردەکان لەکاتی کوشتن و تاڵانی ئەرمەن کوژرابوون !

هەموو کتێبەکەی کەمال مەزهەر باسی خوێنی ڕژاوی ئەرمەنییەکانە بێ ئەوەی فەسڵێکی تایبەت بۆ خوێنی ڕژاوی کوردیش تەرخان بکات، کە وەك شیوعیەکی سۆڤیەتیش تەنها ئەرشیفی ڕووسی دیتبا سەدان هەزار قوربانی مەدەنی بی گوناهی کوردی بەرچاو دەکەوت، کە هەندێ تەقدیری دەکەن بە ٧٠٠ هەزار قوربانی.

# کوردستان دەبێتە ئەرمەنستان!

شتێکیتریش کە پێویستە ئاماژەی پێ بکرێت ترسی کورد بوو لەوەی ئەرمەن دەوڵەتی خۆیان لەسەر زەمینی کوردستانیش بنیات بنێن، ئەوەش لەبەر توندڕەوی و دەبەنگی ئەو دوو حزبەی هانشاك و تاشناق ئەرمەنی بوو، کە وەك تورکمانیان لێهاتبوو هەر بیست ماڵێکی ئەرمەنیان لە هەر شارێ و شارۆچکەیەك هەبا دەیانگووت ئەوە ئەرمەنستانە، وەک چۆن ئەوێ ڕۆژێ کابرای تورکمان گووتی هەولێریش شاری تورکمانە!

ئەرمەنەکان دەیان شاری کوردی وەك وان و خەربوت و ئەرزرۆم و سیواس و مامورەت ئەزیز و هەتا دیاربەکر یشیان خستبوە سەر نەخشەی ئەرمنستان! زلهێزەکان لە نیوەی دووەمی سەدەی ١٩ زاراوەی ئەرمێنیای ڕۆژئاوایان داهێنا لەبەر ئامانجی بەدی خۆیان و بۆ سڕینەوەی ناوی کوردستان لەسەر ئەو شارانەی کە بۆ هەزاران ساڵ کوردستانی بوون وئەرمەن تیایاندا هەمیشە کەمایەتیەك بوون! هەر بۆیەش هەر کە سوپای ڕووسیا وانی داگیرکرد، یەکسەر لە ئەپڕیلی ١٩١٥ دەوڵەتێکی ئەرمەنیان لە وان دامەزراند بەناوی کۆماری وان! ئەو ناوچانەی ناویان ناوە ئەرمینیای ڕۆژئاوا هەمیشە ناوی بە کوردستان هاتوە لە هەموو سەرچاوە خۆماڵی و عوسمانی و بێگانەکانیش .

هەتا والی ئەرزڕۆم پێی دەگوترا والی کوردستان. کونسڵخانەی بەریتانی لەو ناوچەیە ناوی کونسڵخانەی کوردستان بوو، سەرەڕای پشتگیری بەریتانیا لە ئەرمەن! بەڵام زۆر لە مێژە ئەرمەن چاویان لەو خاکانە بڕیبوو، دەیانویست بە زۆر بیانکەنە ئەرمەنستان، هەتا ئەو هەستە پێش ئەو ڕووداوانەش گەیشتە ناخی حاجی قادری کۆیی و کوردی ئاگادار کردەوە لەوەی ئەگەر ئاگاداری خۆیان نەبن ئەوە کوردستان دەبێتە ئەرمنستان!

ئەو قەسیدە مەزنەی حاجی قادر کە کاتی خۆی شیوعیەکی ئایدیۆلۆژستی وەك محمدی مەلاکەریم ڕەخنەی توندی لە حاجی قادر گرێت وبە دوژمنی خەباتی ئەرمەنی لە قەڵەمی دا، لە جیاتی باسی بلیمەتی و هەستی قوڵی پێشبینیەکەی بکات، کە دەگەڕێتەوە پێش کوشتارەکانی سوڵتان عەبدولحەمید.! ل٢٧٤ کردستان في سنوات...

ئەوە چەند سەرنجێکی خێرا بوو لەسەر ئەو بەشەی تایبەت بە کوشتاری ئەرمەن لە کتێبی کردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى ی بەڕێز کەمال مەزهەر. هۆکاری ئەو نووسینەش ئەوە بوو بیرۆکەی ئەو تێزەی کەمال مەزهەر زۆر باوە لەناو گۆڕەپانی فیکری وفەرهەنگی کوردی. بەڵام پێویستی بە وەڵامێکی ئەکادیمی و تێر وتەسەل هەبوو، چاکترین وەڵامیش بۆ ئەو کتێبە و تێزە خوار وخێچ وناهاوسەنگەکانی کتێبی [الکرد و المسألة الارمنية ١٨٧٧-١٩٢٠] ی بەڕێز هۆگر طاهر توفق کە کتێبەکەی تێزی دکتۆرایە لە مێژوو لە زانکۆی زاخۆ وەریگرتوە، هیوادارم وەرگێڕدرابێتە سەر زمانی کوردی.

بەڕاستی کتێبەکەی کەمال مەزهەر بە تایبەتی ئەو بەشەی [الدم الارمني المراق] لە ئاست کتێبەکەی بەڕێز هۆگر تاهیر تۆفیق وەك ئەوەیە ماڵت بسووتێ هاواری زیندانیەك و ئازادێك بکەیت، بێگومان زیندانیەکە کەمال مەزهەرە، زیندانی ئایدیۆلۆژیا و پڕوپاگەندەی شیوعیەت و سیحری یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو.

٢٠٢٠/٥/٦

# پێڕست

# تا ئێستا ئەو ژمارانە دەرچوون

# لە زنجیرەی دۆسێیە فەرهەنگی و فیکریەکان:

**ژمارەی دۆسێکان:**

**ئەندەلوس لە نێوان داگیرکردن و لێبوردەییدا ( ١ )**

**ئەزموونی سێکیولاریزم لە ئیسلامدا! جەلالەدینی ئەکبەر دامەزرێنەری یەکەم حوکمی سێکیولاری لە ئیسلامدا! ( ٢ )**

**ئەفسانەی مەسیحی دەجال و مەهدی ( ٣ )**

**پزیشکی پێغەمبەرایەتی و مەلا عەلی کەڵەك ( ٤ )**

**ئیبن تەیمیە سەلەفیەت و تەعریب ( ٥ )**

**ئیمام نەجمەدین تۆفی، هەوڵێکی تری سێکیولاری لە ئیسلامدا ( ٦ )**

**فەرهاد پیربال: بەهلولەکەی دەسەڵاتی کوردی! ( ٧ )**

**کورد لە نێوان دۆزی فەڵەستین و ئیسڕائیل دا! ( ٨ )**

**خەلافەتی عوسمانی لە شەریعەتەوە بۆ عەلمانیەت (٩)**

**عەبدلواحید خولانەوە لە بازنەی چەمکە سواوەکانی ڕابوونی سەلەفی ( ١٠ )**

**عەبدولڕەحمان سدیق ڕیفۆرم یان یاریکردن بە وشە؟! (١١)**

**چەند دیدێك دەربارەی هونەر و ئەدەب و کتێب و نووسین ( ١٢ )**

**دەتوانی هەموویان لە پێگەی کوردپیدیا دابەزێنیت لەگەڵ هەموو کتێبەکانی نووسەر لەو لینکەی خوارەوە:** کوردیپێدیا - گەورەترین و پۆلێنکراوترین پەرتووکخانەی دیجیتاڵی کوردی! - (١٣,٧٢٤) پەرتووک <br>لە کوردیپێدیادا تاوەکو ئێستا ١١,٤٣٥,٠٢٥ فایل دابەزێنراوە ! (kurdipedia.org)

کوردیپێدیا - محەمەد هەریری (kurdipedia.org)

مكتبة نور اكبر مكتبة إلكترونية عربية مفتوحة للكتب (noor-book.com)

تحميل كتب محمد حريري - Mohammed Hariri pdf مكتبة نور (noor-book.com)

# بەرهەمەکانی تری نووسەر:

- داعش کێیە و مەشروعیەتی لە کام سەرچاوە وەردەگرێت.
- نەورۆز و توندڕەوی سەلەفیەت
- ئەدیب و گزیری پۆلیس کێشەی ئەدەب وسیاسەت لە وڵاتە سۆشیالیستەکان .. وەرگێران.
- خوێندنەوەیەک: لە کتێبی ئەو (حەسەن البنا)یەی کە کەس نایناسێت
- ئافرەت لە نێوان سەرەڕۆیی فێمینیزم و توندڕەوی ئاینیدا.
- ئافرەتی کورد لەژێر هەژموونی گوتاری فیمینیزمی دا
- ئیسلامی سیاسی و فیگەرەکانی لە کوردستان و ئیسلامستان
- کوردستان لە پەنجەرەی غوربەتەوە
- دواهەمین داوای شەیتان...کۆمەڵە چیرۆک
- باوکانی سەلەفیەت دەروازەیەك بۆ سەلەفیناسی
- پەیوەندی شیعە و کورد لە ڕۆشنایی عروبەت و میللەتگەرایی
- مۆتەکەی تورکی لە ئەتاتۆرکەوە تا ئەردۆگان
- چەند باسێکی ئیسلامی سیاسی و کلتوری لە چەند دیمانەیەکدا
- میحنەتی خەلقی بوهتان سکانداڵەکەی عەبدوللەتیف سەلەفی
- گەندەڵستان؛ چیرۆکی ئەزمونێکی تێکشکاو لە باشووری کوردستان
- ڕابوونی مەرگ
- کوشتنی فەرەج فۆدە هەڵوەشانەوەی ئەفسانەی میانڕەوی ئیسلامی
- نەوەیەکی زێڕینی شۆڕش چەند یاداشتێك لە شۆڕشی هەنگاریای ساڵی ١٩٥٦ [وەرگێڕان]

هەموو کتێبەکان دەتوانیت لە سایتی کورپیدیا و مکتبة النور دابەزێنیت لەو دوو لینکەی خوارەوە:
[کوردیپێدیا - گەورەترین و پۆلێنکراوترین پەرتووکخانەی دیجیتاڵی کوردی! - (١٣,٧٢٤) پەرتووک <br>لە کوردیپێدیادا تاوەکو ئێستا ١١,٤٣٥,٠٢٥ فایل دابەزێنراوە! (kurdipedia.org)]

[کوردیپێدیا - محەمەد هەریری(kurdipedia.org)]

[مكتبة نور اكبر مكتبة إلكترونية عربية مفتوحة للكتب(noor-book.com)]

[تحميل كتب محمد حريري - Mohammed Hariri pdf مكتبة نور (noor-book.com)]

# محەمەد هەریری



لە ساڵی ١٩٦٦ لە هەولێر لە دایکبووە. لە بواری نوسیندا بە "محەمەد هەریری" ناودێر کراوە. کۆلێژی ئادابی بەشی ئینگلیزی لەزانکوی سەلاحەدین تەواو کردووە، لە ساڵی ٢٠٠٦ لە وڵاتی بەریتانیا ماستەری لە لە وەرگێڕانی زمانی ئینگلیزی بەدەست هێناوە.

* لە کۆتایی هەشتاکانەوە دەنوسێت لەسەر بابەتی سیاسی و دینی و فیکری و کۆمەڵایەتی.

* لەساڵی ١٩٩٥ کۆچی هەندەرانی کردوەو لە بەریتانیا نیشتەجێ بووە. سەرنوسەری روژنامەیەکی کوردی و گوڤارێکی عەرەبی بووە، بە کوردی و عەرەبی و جاروبار ئینگلیزیش دەنووسێت.

بە بەردەوامە لەنوسین لە رۆژنامەو ماڵپەرە کوردی و عەرەبیەکان، وەك نوسەرێکی کوردی سەربەخۆ خاوەن رای تایبەتی خۆیەتی لەسەر زۆربەی ئەو کێشانەی لە گۆڕەپانی کوردستان و جیهانی ئیسلامیدا روو دەدات.

* سەرەکیترین بواری نووسینی دەربارەی توندڕەوی دینییە لە کوردستان و جیهانی ئیسلامیدا بە گشتی، لەو بوارەدا سەدان وتاری بڵاوکراوەی هەیە. توندڕەوی دینی بە تایبەتی سەلەفیزم بە هەموو فۆرمەکانیەوە. بەڕای نووسەر خوێندنەوەیەك و فکرێکی نامۆیە بە سروشتی دینداری کوردی، ڕاستە لە کۆنەوە کەمێك چەمکەکانی لە رێگای مەزهەبی شافیعیەوە هاتۆتە ناو کورد، چونکە پەیوەندی ئەحمەد و شافیعی وەك پەیوەندی مامۆستا و قوتابییە، هەتا دەڵێن ئیمام ئەحمەد کراسێکی شافیعی شۆردوە و ئاوەکەی خواردۆتەوە! لە کتێبی تاريخ الإسلام الذهبي: ابن خزيمة دەڵێت: "ئایە ئەحمەدی کوری حەنبەل جگە لە مناڵێك لە مناڵەکانی شافیعی زیاتر بوو؟"

بەڵام وەك ئەو لێشاوە سەلەفیەتە نەبووە کە جێگای مەترسی جیدی بێت لەسەر رووحیەتی دینداری کوردی. نووسەر پێی وایە دەبێت کورد رزگاری بێت لە هەموو فۆرمە ئیسلامە نامۆکانی عەرەبی و غەیری عەرەبی، خاوەن دیدو خوێندنەوەو فۆرمی تایبەتی خۆی بێت.

گرنگیەکی تایبەت دەدات بە دۆزی ئافرەت لە ئیسلام و کۆمەڵگای کوردیدا، تا ئێستا سەدان وتار و چەند کتێبێکیشی تایبەت کردوە بە دۆزی ئافرەتی کورد، کە پێی وایە کەوتۆتە نێوان بەرداشی توندڕەوی دینی و توندرەوی هەندێ لە فێمنستەکان.

* هەروەها لە بواری رەخنەی سیاسیش دەنووسێت، بە تایبەتی لەسەر ئەزموونی دەسەڵاتی کوردی. نوسەر خەبات لە پێناو سەربەخۆیی کوردستان و بەرقەرابوونی دیموکراتیەت و مافەکانی مرۆڤ لە کوردستانی گەورە بە گشتی و کوردستانی باشوور بە تایبەتی دا دەکات.

A Series of Cultural & Intellectual Dossiers

Dossier Number: ( 13 )




به نسبەت کوشتاری ئەرمەنەوە، لە ڕاستیدا هەموو مرۆڤێك لە ئێمە دەبێت ئیدانەی ئەو کوشتارەی ئەرمەن بکات و نوسەری ئەو دێرانەش بە توندترین شێوە ئیدانەی دەکات، بەڵام ئیدانە کردنی دەبێت بە شێوەیەکی هاوسەنگ و زانستیانە و واقیعیانە بکرێت، نەك بە ڕووحیەتی تاوانبارێکی پەشیمان بووەوە، بە هۆکاری گرێی هەستکردن بە تاوانێك خۆشت تیایدا سەدان تاوانت بەرامبەردا کراوە، لە یەك کاتدا وەك ئەوان تاوانبار و تاوانلێکراو بوویت. ئەرمەنەکان دەیانەوێت بۆ خەڵك کەیسەکەیان وا وێنا بکەن، کە خەڵکێکی هەژار و بێوەی بوون، لەبەرئەوەی مەسێحی بوون، موسڵمانانی دەمارگرژی تورك و کورد فەتوا و بڕیاری قڕکردنیان دەرکردن، توانیتیان خەڵکێکی زۆر بەو ئەفسانەیە بهێننە باوەڕ، و هەتا ڕۆشنبیرە کوردە ڕۆژنامەوانیەکانیش باوەڕیان کردوە بەو ئەفسانەیە لەبەر چاولێکەری و بێ ئاگایی و تەنکی ئاستی فەرهەنگیان.

دەیەها ساڵە ڕۆشنبیری کورد بەو پەڕی نەزانیەوە مێژوی خۆی هەڕاج دەکات وپۆزش بۆ دوژمنانی دەهێنێتەوە، بێ ئەوەی لە وردەکاری مێژوو وئەو سەردەمە گەیشتبێت.

بە داخەوە بەشێکی زۆری ڕۆشنبیری کورد وادەزانن، خۆ نیشاندان وەك کەسانێکی پێشکەوتوخواز و سێکیولار، بە نەفرەت کردنەوە دێت لە هەموو کلتور و مێژووی با وباپیرانمان، دەیانەوێت بە چاویلکەی ئەمڕۆی سەدەی بیست ویەك مێژووی سەدان ساڵی کورد بخوێننەوە! هەر بۆیەش دەیانبینیت لاوازترین وبێ ئەرزشترین خەڵکن لەناو کۆڕی ڕۆشنبیرانی گەلانی جیهان.







Written by: Mohammed Hariri

First Edition: May 2022

DESIGN : HADI HUNAR